پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامیی
(٢)

# زۆرلێکردن لە ئیسلامدا نییە

## کێشەی هەڵگەڕانەوە و هەڵگەڕاوەکان
## لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ

نووسینی:
دوکتۆر تەها جابر ئەلعەلوانی

وەرگێڕانی:
ئیسماعیل سەید ئیبراهیم

# لا إكراه في الدين

## إشكالية الردة والمرتدين
## من صدر الإسلام حتى اليوم

د. طه جابر العلواني

ترجمة:
إسماعيل سيد إبراهيم

# زۆرلێکردن لە ئیسلامدا نییە

## کێشەی هەڵگەڕانەوە و هەڵگەڕاوەکان لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(٢)

# زۆرلێکردن لە ئیسلامدا نییە

## کێشەی هەڵگەڕانەوە و هەڵگەڕاوەکان لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ

نووسینی:

دکتۆر تەها جابر ئەلعەلوانی

وەرگێڕانی:

ئیسماعیل سەید ئیبراهیم

چاپی یەکەم

١٤٢٨ کۆچی ٢٠٠٧ زاینیی

# زۆرلێکردن له ئیسلامدا نییه

## کێشەی هەڵگەڕانەوە و هەڵگەڕاوەکان لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ


* نووسینی: د. تەها جابر ئەلعەلوانی.

* وەرگێڕانی: ئیسماعیل سەید ئیبراهیم.

* لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ژمارە (٢).

* ژمارەی سپاردن: (١٠٦٧)ی ساڵی ٢٠٠٧ی وەزارەتی رۆشنبیری.

* چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٧.

* تیراژ: ٨٠٠ دانە.

* چاپخانە: کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر.

* ئیمەیلی پرۆژە: iiitkurdistan@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

# دەسپێك

## گۆڕاو و نەگۆڕاوەكان

بێگومان هـەموو گـەل و نەتەوەیـەك كۆمـەڵێك بنـەمای نـەگۆڕ و چەسـپاوی هەیە، كە سورە لەسەر پاراستنیان بە هەموو ئامرازێكی گونجاوو پـەرژینكردنی دەوریـــان بـــۆ ئـــەوەی بیانپـــارێزێ لـــە دەســـكارییكردن و گـــۆڕین و لادان و سووككردن و سـووكایەتی پێكردنیـان، گـرنگترین نـەگۆڕی هاوبـەش لـە نێـوان گەلاندا كە هەمویان دانیان پیاناوە بەوەی كە چەسپاوەو بە هـەموو شـێوەیەك پارێزگـاری لێدەكـەن ((ناسـنامەی گـەل)) و بنـەماكانی مانەوەیـەتی، چـونكە ناسنامەی گەلبوون مانەوەیەتی، كە ناتوانێ وازی لێ بهێنێ، یـاخود سـازش لـە سـەر لایـەنێك لـە لایەنـەكانی، یـان بەشـێك لـە بنـەماكانی بكـات، هـەروەها ناسنامەی گەلانیش جۆراو جۆرن لە ڕووی ڕەگەز و بنەماوە، ئەوەی كە گـەلێك لە گەلان بە بەشێك لە ناسـنامەی خـۆی دادەنـێ گـەلێكیتر پێـی وانییـە وابـێ، بەڵام خاڵی هاوبەش لـە نێـوان گەلانـدا – بـە گشتیی – پێویـستی ڕێزگرتنـی ناسـنامەكەیانە، هـەروەها پاراسـتنیەتی بـە هـەموو ڕەگـەز و بنـچینەكانیەوە، هەموو گەلان وادەزانن پێویستە لەسەریان كە شتی بە بەها و بـەنرخ بكـەن بـە قوربـانی و خـوێن و گیـان ببەخـشن لـە پێنـاو پارێزگـارییكردن و مانـەوەی ناسنامەكەیان و هەموو بنەماكانیدا.

ئەوەی جێگای گومان نییە کە زۆربەی گەلان – پێش ئەم سەردەمە – ئایینەکانیان بە گرنگترین کۆڵەکە و پایەی ناسنامەکانیان زانیوە، لەو گەلانەش: ڕۆمانە بتپەرستەکان پێش پیادەکردنی مەسیحیەت، بابلیەکان و گەلانی تریش، ئەمە جگە لەو گەلانەی کە بوون و مانەوەیان و دروستبوونی ناسنامەی تایبەت بە خۆیان پەیوەست بووە بە پەیڕەوکردنی ئایینێك لە ئایینەکان و خۆبەستنەوە پێوەی، لێرەوە زانایانی فیقهی ئیسلامی دوور نەڕۆیشتوون کە ئایینیان وەکو یەکێك لە پێنج پێویسیەکانی مرۆڤ داناوە، هەروەها بە فاکتەری سەرەکیی زۆرێك لە یاسا گرنگەکانیان داناوە، بە تایبەت کە جیهادیان کردووە بە ئامرازی داکۆکیکردن و پاراستنی دین لەسەر ئاستی ئوممەت و جێبەجێکردنی سزای هەڵگەڕانەوە لەسەر ئاستی تاکەکەس، چونکە بە هۆی جێبەجێکردنی سزای هەڵگەڕانەوە لە دین ئایین پارێزراو دەبێت لە فێڵ و یارییپێکردن و دەرچوون و هەڵگەڕانەوە لێی، وە شەرعزانانی مسوڵمانیش لە کاتێکدا دان بەم ڕاستیەدا دەنێن کە هیچ دژایەتییەك نابینن لە نێوان جێبەجێکردنی سزای هەڵگەڕانەوەو ئازادی ئاییندارى و زۆر نەکردن لە مسوڵمانبووندا، بە درێژایی سەردەمە جیاوازەکانی مێژووشمان ئەم بۆچوونە – جێبەجێکردنی سزای هەڵگەڕانەوە لە بەرامبەر بوونی ئازادیی ئایینیدا – زاڵبووە بە شێوەیەك کە ڕاو بۆچوونی شەرعزانانی گەورە کە جیاوازبووە لە زۆرینەی فوقەها و قورسایی خۆیان هەبووە پشتگوێ خراوە، کەسانی وەکو عومەری کوڕی خەتتاب (ساڵی ٢٣ك – ٦٤٤ز شەهید کراوە) و ئیبراهیمی نەخەعی (١٩٦ك وەفاتی کردووە) و سوفیانی سەوری (١٦١ك وەفاتی کردووە) و چەندین ناوی درەوشاوەی تر ڕاکانیان وەرنەگیراوە و پشتگوێ خراوە، ئەمەش وایکردووە لەوانەی حوکمە شەرعییەکانیان گێڕاوەتەوە و گواستۆتەوە

دەنگۆی ئەوە بڵاوبکەونەوە کە ئەم حوکمە کۆدەنگیی لەسەرە و زۆربەی زۆری زانایان و شەرعناسان پەیڕەویان کردووە، ئەویش بە زۆرکردن لە کەسی هەڵگەڕاوە لە دین کە بگەڕێتەوە ناو ئیسلام، یان ئەگەر نەگەڕایەوە بکوژرێ، ئەمەش لەبەر پاراستنی ئایینی ئیسلام لە سووکایەتی پێکردن و لادان لێی، چونکە سەرچاوەی دامەزراندنی ئوممەی ئیسلامیی و شەرعیەتی دەوڵەتە، هەروەك سەرچاوەی عەقیدە و شەریعەتە و یاساکانی ژیانە — هەموو یاساکان — لە ئوممەتی ئیسلامیی و دەوڵەتی ئیسلامییدا، سەیریش نییە کە لە دواییدا ئەم حوکمە جێگیر ببێت لە ئەقڵ و هۆش و بڕیارە دادوەریەکاندا وەکو یەکێك لە سزا شەرعییە جێگیرەکان کە کۆدەنگی شەرعناسانی لەسەرە، بە شێوەیەك کە تاووتوێکردن و قسە لەسەرکردنی لای زۆرێك نەشیاوە، کە چۆن دەکرێ قسە لەسەر بابەتێك بکرێ کە فوقەها لەسەری کۆدەنگ بن؟!

ئەگەر ململانێی شارستانیی ئەم سەردەمە نەبوایە کە ڕەخنە و پیاداچوونەوەی کرد بە پێوەرو مەنهەج و دەسەڵاتی تەواوی پێدا لە شیکردنەوە و ڕەخنەگرتن لەهەر شتێك کە بویسترێ، ئەوا فایلی ئەم بابەتە دووبارە نەدەکرایەوە لەم سەردەمەدا، سەرەتاش پێشڕەوانی ڕیفۆرمەکان ئەم بابەتەیان ورووژاند، کە هەریەك لە ئەفغانی و موحەممەد عەبدە و ڕەشید ڕەزا[1] و چەند کەسێکیتر بوون بە مەبەستی ئەوەی کە ئەم کێشەیە لەگەڵ

[1]. کاتێك ناوی چاکسازەکان دەبەم یاخود دەڵێم پێشڕەوانی بزووتنەوەی چاکەخوازیی، مەبەستم لەمانەیە: جەمالەددینی ئەفغانی (و:١٨٩٧) و لەم کتێبانەدا باسی ژیانی کراوە: کتێبی موحەممەد پاشا مەخزومی بە ناونیشانی (خاطرات عن جمال الدين الأفغاني) و کتێبی (جمال الدين الأفغاني: المفترى عليه)ی موحسین عەبدولحەمید، هەروەها پێشەکی (سەرجەم کارەکانی جەمالەددینی ئەفغانی)ی موحەممەد عەمارە. هەروەها موحەممەد عەبدە (و:١٩٠٥) موفتی میسر لە سەردەمی خۆیدا و ژیاننامەی ئەمیش بە پێنووسی قوتابییەکی کە ناوی ڕەشید ڕەزایە نووسراوە، هەروەها لە پێشەکی (سەرجەم کارەکان)دا هاتووە: یەکێکی تر لەو چاکسازانە ڕەشید

ئازادی ئاییندارییی و ڕادەربڕیندا تێکدەگیرێن، هەروەها لەگەڵ مافەکانی مرۆڤدا نایەنەوە کە باس لە هەڵبـژاردنی ئـایین دەکـات لەلایـەن مرۆڤـەوە و ئـازادیی گوزارشتکردن لەو بیرو باوەڕەی هەرکەسێك هەڵیگرتووە بەبێ زۆرلێکردن، لـەو کاتەدا بەم چاکسازانە وترا: کە لە ئیسلامدا زۆرلێکردن هەیە مادامێك زۆری لـە واجبە زۆری لە کەسی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام بکرێ بۆ گەڕانـەوەی بـۆ دیـن یـان دەکوژرێ، هەروەها ئەمە پێشێلکردنی ئـازادی بـیرو بـاوەڕ و ڕادەربڕینـە، لـەم ڕووەوە وەڵامـی چاکـسازەکان جۆراوجـۆر بـوو، بـەڵکو هەنـدێکیان پۆزشـیان دەهێنایەوە، ئەفغانی کتێبە بەناوبانگەکەی (الرد علی الـدهريين)ی نووسـی بـۆ ئەوەی ئەوە دووپات بکاتەوە کە پێویستە شـوێن قورئـان بکـەوین لـە گفتوگـۆ لەگەڵ نەیاراندا و دیالۆگیان لەگەڵدا بکەین، وە گومـان و دوودڵـی بەڵگـەکانیان پوچەڵ بکەینەوە بە بەڵگەو دەلیلی ئیسلامیانە، بەڵام ئـەم کێـشەیەی کۆتـایی پێنەهێنا و بە شوێنی دەبەرێکڕاچـوون و موناقەشـە مایـەوە، لـە هـەر کاتێکـدا باس بکرایە ئاماژەی بۆ دەکراو دەنگ بەرزدەکرایەوە لە ئاست ئەو کێـشەیەدا، هەندێ زانای تریش بە چپەوە ڕاکانی خۆیان دەدرکاند، چونکە پێچەوانەی ڕای زۆرینــە بــوو لەســەر ئــەم بابەتــە و گومــانی خۆیــان دەردەبــڕی لــەوەی کــە کۆدەنگیی لەسەر بێت، ئەم چرپەیە لە شێخ (شلتوت — و:١٩٦٣)ەوە بیـسترا، لـەدوای ئـەویش شـێخ (محمـد أبـو زهـرة— ١٩٧٤) شـوێنی کـەوت، هـەروەها

---

ڕەزایە (و:١٩٣٥) نووسەری تەفسیری (المنار)، هەروەها خاوەنی گۆڤاری مەنار، ئەمیش لە زۆر شوێندا باسی ژیانی کراوە، لەوانە: (آراء سياسية لرشيد رضا) بە پێنووسی (وجيه كوثراني)، (الغـرب في نظـر رشـيد رضـا) و (الجامعـة الإسلامية للدكتور فهد الشوابكة)، هەروەها چاکسازێکیتر (الکواکبي)یە (و: ١٩٠٢) خاوەنی کتێبی (أم القـرى) و (طبائع الاستبداد)، دابەشبوونێکی فراوان هەیە لەسەر هەڵسەنگاندنی ئەم کەسایەتیانە و ڕۆڵیـان، بـەڵام جیـاوازی نییە لە نێوان لێکۆڵەراندا لەسەر گرنگیی بایـەخی بەرهەمـە بـەجێماوەکانیان و کاریگـەرییان لەسـەر پێکهێنـانی ئەقڵیەتی نوخبەی عەرەبی لە سەدەی ڕابردوو (واتە نۆزدە) و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا.

کەسانیتریش[1]، بەڵام ئەمانە دەنگیان بەرز نەکردەوە بۆ وتنی ڕاکانیان، بەڵکو بێدەنگییان هەڵبژارد و ئەوەی زانا پێشووەکانیان دەوتەوە (لەم سەردەمەدا شتگەلێك هەن ئەگەر دەریان ببڕی ئەوە ئەوە دەبێت)، بۆیە کەیسی ئەم بابەتە بەنیوەکراوە و نیوە داخراوی مایەوە. دواتر ڕووداوی لە سێدارەدانی (علي محمود طه) لە سودان لە ساڵێ ١٩٨٥دا هاتە پێشەوە، لە کاتێکدا سەرۆکی سودان (جعفر نميرى) پیادەکردنی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامیی ڕاگەیاند، لەو کاتەدا دکتۆر حەسەن تورابی جێگری گشتی بوو، ڕای تایبەتی هەبوو لەسەر هەڵگەڕانەوە، بەڵام لەوکاتەدا ڕاینەگەیاند، بەڵام لە ناو لایەنگران و قوتابیەکانیدا بڵاو بوو، بۆیە دادگای سودانی بە سەرۆکایەتی قازی (الكباشي) حوکمی کوشتنی کابرای دەرکرد کە تەمەنی حەفتاو نۆ ساڵ بوو، بەبەرچاوی جێگری گشتییەوە کوژرا بێئەوەی نەیاریی دەرببڕێ. هەروەها کاتێك (فيصل بن مساعد) حوکمی کوژرانی دەرچوو بە شمشێر بە تۆمەتی هەڵگەڕانەوە، لە کاتێکدا کە پێشتر دانی نابوو بە تاوانی کوشتنی ئەنقەست کە ئەمەیان بەس بوو لە ڕووی شەرعییەوە بۆ لە سێدارەدانی و پێویستی بەوە نەدەکرد قازی و زاناکان تۆمەتی تر بدەنە پاڵی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە سەروبەندی کوشتنەکەیدا باسی هەڵگەڕانەوەکەشی کرابوو، بەڵام لەوکاتەدا ئەم مەسەلەیە کێشەیەکی دروست نەکرد، نەزانرا ئایا هەڵگەڕانەوەکەی تاوانی سەرەکی کوشتنەکەی بوو یاخود تۆمەتەکەی تری؟ حوکمی دادگا ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردبوو.

دواتر مەسەلەی کوشتنی (سلمان رشدى) هاتە پێش و فەتوای جۆراوجۆر لەبارەیەوە دەرچوو، لەوانە فتوای ئیمام خومەینی (و:١٩٨٩) کە

---

[1]. بۆ ئەم مەبەستە سەیری کتێبی (الإسلام عقيدة وشريعة)ی شێخ (محمود شلتوت)، القاهرة ١٩٦٦ بکە.

بەناوبانگترینیان بوو بۆ حەڵاڵکردنی خوێنەکەی، کە کێشمەکێشمێکی زۆری بە دوای خۆیدا هێنا، بۆیە کێشەکە بوو بە کێشەیەکی جیهانی و هەموو ڕۆژئاوا کەوتنە باسکردنی مافە پێشێلکراوەکانی مرۆڤ، لەوانە مافی دەربڕین و ئاییندارییی، بەوەش ئیسلامیان بە دەستدرێژکار دەزانی بۆ سەر باڵاترین بەهای هاوچەرخی ڕۆژئاوا، کە بەهای ئازادییە، هەروەها زۆربەی ئەو فەتواو کتێبانەی کە دەرچوون قسە و بەڵگەی شەرعزان و زانایانیان دەهێنایەوە یەر کە باس لە واجببوونی کوشتنی هەڵگەڕاوە دەکەن، ئەوەش پێچەوانەی مافەکانی مرۆڤ نییە و تێکگیرانێکی لەگەڵ ئازادیی ڕادەربڕین و ئاییندارییدا نییە، هەندێکیان دروشمی (بەڵێ بۆ ئازادیی فکر، نا بۆ ئازادیی کوفر)یان بەرزکردەوە، ڕۆژئاوا وەکو خۆی مایەوە و ڕۆژهەڵاتیش هەروا — وەکو دەڵێن —، بەریتانیا لەسەر حسابی گرژبوونی باری ئابووری و هەژاریی دەیان ملیۆنی خەرج کرد بۆ پارێزگاری سەلمان ڕوشدی لە دەستی مسوڵمانان، کە فەواکان و قسەو باسەکان کردیان بە هێمایەکی جیهانی بۆ ئازادی لە کاتێکدا کە ئەو جگە لە بەکرێگیراوێکی سووك هیچی تر نەبوو، کتێبەکەشی کرد بە ڕێگایەکی خۆناساندن و باڵۆنی تاقیکردنەوە.

دوای ئەمە کێشەی پەنهانکوژیی (فرج فودة) لە لایەن هەندێ گەنجی کۆمەڵە ئیسلامییەکانی میسرەوە هاتە کایە، پارێزەرەکەیان میانڕەوترین زانای ئەوکاتەی بانگکرد کە شێخ (محمد الغزالي و:١٩٩٦) بوو، ئەویش هیچ چاری نەبوو جگە لە پەسەندکردنی ڕای زۆرینەی زانایان لەم بوارەدا کە واجببوونی کوشتنی هەڵگەڕاوەیە، بەمەش فەرەج فۆدە بووە هەڵگەڕاوە و شایانی کوشتن، ئەو گەنجانەش بە پێویستیان دەزانی حوکمی شەرع جێبەجێ بکرێ بە سەر کەسێکی خوێن حەڵاڵکراودا، دەوڵەتیش بە پێویستی دەزانی کە خۆی

خوێنەکەی بڕێژێ چونکە ئەگەر ئەوەی نەکردایە، ئەوا ئەو گەنجانە فەتوای خۆیان بە سەر دەوڵەتیشدا دەدا، ئەوەی کە پێویست بوو دەرهەق بە ئەویش دەیانکرد، بەمەش لە میسردا هەرایەکی گەورە دروست بوو کە دانەدەمرکایەوە، هەروەها گفتوگۆ و مشتومڕی زۆر لە نێوان زانایان لایەنە سیاسی و لیبڕالیو پارێزەر و مافناس و ڕۆژنامە نووساندا دروست بوو، کە پێشتر بە هیچ شێوەیەك میسر بە خۆیەوە نەبینیبوو، بە شێوەیەك نووسین و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان کە نووسران لەسەر ئەو بابەتە، دەگەیشتە نزیکەی نۆ بەرگی گەورە، بەمەش دەرگاکە دانەخرا و کێشەکە کۆتایی نەهات، لەسەروبەندی دامرکانەوەی ئەم کێشەیەدا کێشەی (د. نصر حامد أبو زید)یش قووت بووەوە، کە دیسان تۆمەتبار کرا بە هەڵگەڕانەوەو یەکێك هەستا بە بەرزکردنەوەی داوا لەسەری بۆ جیاکردنەوەی ژنەکەی لێی و مامەڵە لەگەڵکردنی وەکو هەڵگەڕاوەیەك، دووبارە دەرگای ئەم باسە کرایەوە و خەڵکی کەوتنەوە نووسینو قسە لەسەرکردن و نووسینەکان گەیشتنە نزیکەی پێنج بەرگی گەورە، جگە لە کتێبەکانی تاوانبارکراو کە گرنگترینیان (التكفير في زمن التفكير — بەکافرکردن لە سەردەمی بیرکردنەوەدا) بوو، ئەمە جگە لە بەرنامەو قسەکانی سەر شاشەی تەلەفزیۆن و ڕادیۆکان، بەمەش دکتۆر ئەبو زەید بوو بە هێمایەك لە هێماکانی ئازادی و داواکاریی زانکۆکانی ئەوروپا و ئەمەریکا زیادی کرد لەسەری بۆ کارکردن تیایاندا، ئەو و موحەممەد ئەرەگۆن بوون بە دوو ڕاویژکار بۆ گرنگترین کاری ئینسکلۆپیدی ڕۆژئاوایی تایبەت بە قورئان کە زانکۆی (لیدن) سەرپەرشتی دەکات، هەروەها پێش ئەوەی مەرەکەبی کێشەکەی (أبو زید) وشك بێتەوە، کێشەیەکی تر سەریهەڵدا کە تایبەت بوو بە (د. حسن حنفي) و هەمان تۆمەتی درایە پاڵ، دیار بوو کە ئەزهەر و کۆمەڵێك

لایەنیتر وایان بە باش زانی کێشەکە کۆنترۆڵ بکەن و نەهێڵن گەورە ببێت، بۆیە هێرشکردن بە ناوی ئیسلامەوە کەمکرایەوە بۆ سەری، بەڵام نەتەوە یەکگرتووەکان و لایەنە پەیوەندیدارەکانی و دامەزراوەکانی سیستمی نوێی جیهانیی نەوەستان لە هێرشکردنە سەر ئیسلام و تاوانبارکردنی بەوەی کە لە هەموو ئایینەکان زیاتر دژی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە، بەڵگەشیان ئەوە بوو کە تائێستاش چەمکی هەڵگەڕانەوە پیادە دەکات و سزای کوشتنیشی بۆ دادەنێ، ئیتر چۆن دەتوانرێ ئەم کێشەیە چارە سەر بکرێ کە تائێستاش بەردەوامە؟

لە کاتێکدا ئێمە سەرگەرمی ئامادەکردنی ئەم کتێبەین، میسر سەرگەرمی کێشەی (د. نوال السعداوي) و جیاکردنەوەیەتی لە مێردەکەی، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە هەندێ لێدوانی ئەو لە گۆڤارێکدا بڵاوکراوەتەوەو تیایدا گاڵتە بە هەندێ حوکمی شەرعی دەکات، ئێمە هەندێ سەرنجمان هەیە لەسەر ئەم جۆرە داوایانە کە لە شوێنی تایبەت بە خۆیدا باسی لێوە دەکەین، هەروەها ڕای شەرعناسان دەهێنین لەسەر چۆنیەتی سەلماندنی هەڵگەڕانەوە، بەڵام لێرەدا دوو هەڵوێستی دکتۆرە نەوال باس دەکەم، یەکێکیان لە مەغریب و ئەویتر لە ئەمریکا، کە تەنها ئەوەی ئەمریکا باس دەکەم، لە کاتێکدا بەرگری لە ئیسلام کردووە و پاڵپشتیی لێکردووە، لە بەرامبەر سەدان مامۆستای پسپۆڕ لە لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەو وتوویەتی: "ئێوە ئەی مامۆستاگەلی ڕۆژئاوایی، هانمان دەدەن لەسەر وازهێنان لە دینەکەمان و هەڵگەڕانەوە لە کلتوور شارستانییەتمان، هەروەها دەڵێن ئیسلام دژی ئافرەت و مافەکانیەتی، بەڵام منیش زۆر کاری ئێوەم زانیوە لە جیاوازی و دووبەرەکی و بەکەمزانینی گەلانی غەیری خۆتان، بەڵام ئەم شتانەمان لە ئایین و

ڕۆشـنبیری و داب و نـەریتی خۆمانـدا نـەبینیووە". بەڕاسـتی ئـەم قـسەیەی گریاندمی لە کاتی خۆیدا کە گوێم لێی بوو، هیوادارم کە ئەم هەڵوێستە لـە لای خوای گەورە تکاکاری بێـت ئەگـەر تـوانی بـەردەوام بێـت لەسـەر ئیمانەکـەی، سەرەڕای گێژەڵوکە و زریانیش.

گومان لەوەدا نییە کە خـەڵکانی هەڵگـەڕاوە هـەن و کەسـانێکیش هـەن کـە خۆیان لە ئیسلام بێبـەریی کـردووە، ئیـسلامیش پیـسیی ئـەمانی قبـوڵ نییـە، بەڵام زۆر پرسیارم لەخۆم کرد ئەگەر ئەم سزایە جێبەجێ بکرایە لـە سـەردەمە جیاوازەکـانی مێـژووی ئیـسلامییدا، بـە شـێوەیەکی ورد و تـەواو؟ ئایـا هەڵگەڕانەوە دەوەستا؟ ئایا کۆمەڵگا مسوڵمانەکان لـەمڕۆدا خـاڵی دەبـوون لـە کەسانێك کە ئاڕاستە فیکـری و بێباوەڕیـەکانیان پیـادە دەکـرد و خۆیـان گێـل دەکەن لە ناسنامە و بیرو باوەڕی ئیـسلامیی؟ ئایـا ئەوانـەی کـە پەیوەنـدییان کـردووە بـە حیـزب و جووڵانـەوە سیاسـی و کۆمەڵایەتییـەکانی کـە پـەیڕەوی سۆشیالیـستی و مارکـسیەت و بوونگـەرایی و شـتی تریـان کـردووە، پەیـدا دەبـوون؟ یـان بـا پرسـیارەکە بگـۆڕین و بڵـێن: ئەگـەر سـزای هەڵگەڕانـەوە جێبەجێ بکرایە لە وڵاتی مسوڵمانان‌دا، ئایا ئەوانەی تەمەنێکی گرنگیان بەسـەر بـردووە لەگـەڵ مارکـسیەتی لینینـی و عەلمانیـەت و بێـدینی و پوچـگەرایی و نەهلـستی و بوونگـەرایی، دواتـر گەڕاونەتـەوە بـە ویـستی خۆیـان دوور لـە دادگاییکردن و ناسنامەی خۆیان دۆزیوەتەوە، هەروەها سەر لەنوێ ئیسلامیان کردووە بە بەرنامەی خۆیان، ئایا ئەوانە ئـەمڕۆ دەمـان لـە ژیانـدا؟ دەیـانتوانی ئەو بەرگری و داکۆکیەی کە دەیکەن لە ئیسلام بیانکردایە؟

لێـرەوە خـۆم کێـشایە نـاو لێکۆڵینـەوەی ئـەم سـزایە بـۆ گەیـشتن بـە تێگەیـشتنێکی ورد و دروسـت کـە لایەنـەکانی دیـاری بکـات و باکگراونـد و

ڕەهەندە جیاوازەکانی ئاشکرا بکات. بنەمای گشتی ئیسلامیی کە قورئانی پیرۆز هێناویەتی بریتییە لە (ئازادی ئایینداریی) و (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ)، بینیم کە پیاچوونەوە بەم بابەتەدا بە پیاچوونەوەیەکی گشتی شەرعییانە تینوێتی دەشکێنێ، زۆر گرنگیشە هەتا ئەگەر لەم باسەشماندا بگەینە هەمان ئەنجامی پێشوو، بەڵام هیچ بەربەستێك نییە ئەگەر ئەنجامی دووەمیش بێت دوای گەڕان و لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر بۆ پەیامی خواو سوننەتی پێغەمبەرﷺ دەبێت براوامان پێی هەبێت بە سەرەتاو کۆتایی، هیچ جێی نەنگیش نییە ئەگەر تەسلیمی هەر حوکمێك لە حوکمەکانی خوای گەورە ببین و ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی.

دەبێ سوپاسی خوا بکەین و شوکرانەبژێری بین کە ئەم باسە دوای ئەوەی ڕێڕەوی خۆی وەرگرت، تیایدا (مەنهجی مەعریفیی قورئان)مان وەرگرت کە ڕێنماییکەری باشترین ڕێگایە، بۆیەش گەیشتینە کۆمەڵە ئەنجامێکی زۆر گرنگ کە نامانەوێ خوێنەر پەلە بکات لە زانینیاندا، زۆر نییە ئەگەر تۆزێك ئارام بگرێ هەروەکو چۆن ئێمە بە ئارام بووین، تا بابەتەکە بە وردی و لەسەرخۆو بیرلێکردنەوەوە کە شایستەی کەسی عەودالّی ڕاستی و زانستە بخوێنێتەوە، بەڕاستی وزە وتونا و کاتێکی زۆرمان لە خوێندنەوە و بیرکردنەوە و تێڕامان و ئیجتیهاددا خەرج کرد، بەڵام – پێش ئەوە و دوای ئەوەش – توانایەکی بەشەریە، توانای بەشەریش – هەرچۆنێك بێت – جێگای کەمتەرخەمی و کەموکورتیە، جا ئەوەی شتی باشی تیا دەست کەوت با دوعای خێرمان بۆ بکات لە پاش ملە، چونکە لە هەموو کەس زیاتر پێویستیمان بە دوعای خێرە، ئەوەشی کەموکورتی تیا بینی، با داوای لێبوردنمان بۆ بکات لە خوا و

عەیبەکانمان پێبڵێ، ئێمەش تەنها چاکەمان مەبەست بووە و یارمەتیش هەر لای خوای بە توانا و خاوەن سوپاسە.

دەزانم هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵێك هەن زۆرێك لەو شتانەی کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا هاتوون بە دڵیان نییە، من ناترسم لەوانەی کە زانان و عەودالّی زانستن کە لە گەڵمدا نەبن لە بۆچوونەکانما، چونکە ئەمان کۆکبن لەگەڵم یان نا، خاوەن زانستن و هەڵسوکەوتی زانا و فێرخواز دەزانن و شارەزای ئەدەبی ئیختیلافن، نەشارەزایانە قسە ناکەن و پێشەکی بەرامبەر تاوانبار ناکەن، بەڵام من لە قسەی کەسانی دۆگما دەترسم کە (جاحظ) پێیان دەڵێ (خاوەن ئەقڵی ڕەشۆکی)، ئەوان دەماری ملیان هەڵدەستێت بەوەی کە وتوومە و نووسیومە، دڵنیاشم ئەقڵی ڕەشۆکی تیایاندا دەجووڵێ و نووسەر بە چەندین تۆمەت تۆمەتبار دەکەن و ئەوەی پشتگیریشی بکات بە دەردی ئەوی دەبەن، ئاخر خاوەن ئەقڵی ڕەشۆکی "پێویستیان بە تێڕامان و بیرکردنەوە نەماوە و وازیان لە گەڕان هێناوە بە دوای ڕاستیدا، چونکە پەندیان لە ڕابردوویان وەرنەگرتووە[1]"، هەندێ شتیان بیستووە و بەر گوێ کەوتووە، لە ئەقڵیاندا جێگیر بووە، دوای ئەوەی لاساییکردنەوە ڕەگی داکوتاوە تیایاندا و وایکردووە کە ئەفسانە و شتی پووچ زوو بچێتە مێشکیانەوە، بەڵام چوونە ناوەوەی حەقێك لەسەر بنەمای بەڵگە و بورهان قوورس و گرانە، ئەو ئەقڵانەی کە ساڵانێك لەسەر لاسایی ڕاهاتوون، هیچ نەزان و وشکن و جگە لە وەرگرتنی سلبی و تەسلیمبوون بەو شتەی کە لای زۆرینە بڵاوە هیچی تر نییە، لە کاتێکدا قورئانی بەرز و پیرۆز خەڵکی فێری گەڕان بە دوای بەڵگەدا دەکات، کە هیچ شتێك وەرنەگرن تا نەگەنە قەناعەت بە هۆی بەڵگەیەکەوە: (قُلْ هَاتُواْ

1. ئەمە قسەی (جاحظ)ە کە موحەممەد کورد وەریگرتووە لە کتێبی (أمراء البيان).

بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) (البقرة: ١١١)، هەروەها دەفەرموێ: (قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إَلاَّ تَخْرُصُونَ) (الأنعام: ١٤٨).

خوای گەورە ناردنی پەیامە ئاسمانیەکانی بەستۆتەوە بەوەی کە خەڵکی لای خوا بەڵگەیان نەمێنێ بۆ بڕوانەهێنان، وەك دەفەرموێ: (رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزاً حَكِيماً) (النساء: ١٦٥)، لە کاتێکدا خوای دروستکەرو گەورە وا دەفەرموێ، واتە توانای بەڵگەهێنانەوەشی بە مرۆڤ بەخشیوە، ڕێگەشی پێداوە کە داوای بەڵگە و نیشانەکان لە خوای خۆی بکات ئینجا لە پێغەمبەران و نێردراوان، ئەمە چجای ئەوەی کە داوا لە خەڵکیتر بکات، بەلاّم کۆلکەزانا و نیمچە قوتابیانی زانست و خەڵکی بەگشتی جگە لە شوێنکەوتەیی قسەی ئەوانیتر و لاسایی بە ئەقڵێکی دۆگماوە هیچی تریان لەدەست نایەت، لەبەر ئەوە خەڵکی ستەمکار و بانگخوازانی درۆینە دەزانن چۆن بەکاریان بهێنن و هەڵیان سووڕێنن لە چوارچێوەی پڕۆژەکانیاندا، بۆ گەمارۆدانی بانگخوازانی هەق و چاکەخوازان، ئێستا کە ئەم بابەتە ئامادە دەکەم، بیرمە کاتێك قوتابی بووم بە منالّی لای شێخ (عبدالعزيز السامرائي) – خوا غەرقی ڕەحمەتی بکات – زوو زوو ئەم فەرموودەیەی دەدا بە گوێماندا کە دەفەرموێ: (يوزن يوم القيامة مداد العلماء بدماء الشهداء)[1]، واتە: ڕۆژی قیامەت مەرەکەبی زانایان بە خوێنی شەهیدان پێوانە دەکرێ و دەکێشرێ. چەند دڵخۆش دەبووم لەوکاتەدا کە ئەم فەرموودەیە و هاوشێوەکانیم دەبیست، وەکو ئەوەی دەفەرموێ: (من سلك

[1]. بڕوانە: (تخريج العراقي على إحياء علوم الدين ١/١٠)

طريقاً يلتمس فيه علماً سهّل الله له طريقاً إلى الجنة)[1]، واته: هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ فێربوونی زانست، ئەوا خوای گەورە ڕێگایەکی بۆ چوونە بەهەشت بۆ ئاسان دەکات. ئەمانە و چەندین فەرموودەی تر شێخ زۆر باسی لێوە دەکردن بۆ هاندان لەسەر فێربوونی زانست، بەڕاستی کە لەو کاتەدا هاندانێکی باش بوو بۆم، زۆر جار دەمپرسی باشە چۆن مەرەکەبی زانایان بە خوێنی شەهیدان دەکێشرێ لە کاتێکدا ئەوان لە قوتابخانە و مزگەوتەکاندا دانیشتوون و دەرس دەڵێنەوە، بە ئارامی و لەسەرخۆیی، هەندێجاریش پاداشت دەدرێنەوەو شتیشیان بۆ دەکرێ لەملاولا؟ ئەم ژیانە خۆشە لە نێوان کتێبو کاغەز و قەڵەمدا لە کوێ و ژیانی موجاهیدێك لە کوێ کە ڕووبەڕووی چەندین تیاچوون دەبێتە و دەکوژێ و دەشکوژرێ؟ تا گەورە بووم ئەم پرسیارەم هەر بۆ وەڵام نەدرایەوە، بەڵام دوای ئەوەی کە پەنجا ساڵم لە تەمەنم بڕی، خەریکە وردە وردە سەرەتاکانی ئەم پرسیارەم بۆ ڕوون دەبێتەوە، دەستم کرد بە قۆناغی ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵکی بە قورئانی پیرۆزو ڕێگای بەرنامەی (أسلمة المعرفة – بە ئیسلامکردنی مەعریفە)، ئەم بەرنامەیە وایلێکردم کە سەیری ئیسلام بکەم بە سەرتاپاگیری و مەبەستەکانی شەریعەتەکەی، هەروەها ئامانجەکانی بەرنامەکەی و تایبەتمەندیەکانی پەیامەکەی، نەك سەیرکردنی وردەکارییەکانی فیقه و مەعریفە نەقڵیەکان، هەروەکو چۆن لەگەڵیا دەستم کرد بە قۆناغی تێڕامان لە حاڵی ئوممەتی ئیسلام کە نموونەیە هاتووە بۆ خەڵکی، هەروەها ئەو تەحەددا و ململانێیانەی ڕووبەڕووی کەلەپوور و مێژووی دەبێتەوە، لە بەرامبەر مێژوو و کەلەپوورە خەڵکی ترەوە، لەبەر ئەوە لەمبارەیەوە بۆچوون و مەعریفەیەکی مەنهەجیم لا

[1]. فەرموودەی ژمارە (٣٦٩٩) لە (صحيح البخاري)، هەروەها ژمارە (٢٦٤٦) لە (صحيح الترمذي).

دروست بوو دەبارەی زۆر شت کە ڕووبەڕووم بوونەوە بەشێوەی جیاواز، هەندێکیان لە شێوەی تەحەددا و هەندێکی تریان بە شێوەی پرسیار، بۆیە دواتر دەستم کرد بە گەڕان بە دوای دەرگایەکدا بۆ دەرچوون لەم کێشانە، نەك لە سەر ئاستی تاکەکەس و حەزی ئەوەی کە ڕزگارم ببێ بە تەنیا بە بڕینی ڕێگایەك کە خوای گەورە بە لوتفی خۆی بمخاتە بەهەشتەوە، بەڵکو لەسەر ئاستی ڕزگاریی ئوممەت بەگشتی لە کێشە و تەنگژەکانی و ئەو واقیعە خراپەی ئێستای، بڕوای تەواویشم بەوە هەیە کە یەکەم هەنگاو بۆ چاکسازی و ڕزگارکردنی ئەم ئوممەتە دەبێ هەنگاوێکی فیکریی بێت، بێگومان دەبێ مەنهەجەکانی بیرکردنەوە چاك بکرێن، کە هەندێ بیری ژەهراوی لەناوبەر توانای هێزی ئەم ئوممەتەیان لە ناو بردووە، وەك: جەبریەت و پشتلێکردنەوە، تێنەگەیشتن لە وەزیفە و کاری هۆکارەکان، تێنەگەیشتن لە سروشتی سوننەتە خواییەکان و دنیاییەکان، ئەمانە و چەند بیرو بۆچوونێکی تری لەناوبەر یەکیان گرتووە کە ناتوانن بەرەوپێش چوونێکی شارستانی دروست بکەن، هەروەکو کە ناتوانن یارمەتیدەر بن بۆ بەرەوپێشچوون خۆیان بەسن بۆ لەناوبردنی ئەوەشی کە هەیە.

لە چوارچێوەی گەڕان بە دوای ڕەگ و ڕیشەی ئەو فیکرە ژەهراوی و لە ناوبەرانەدا، ڕێم کەوتە کۆمەڵێکی زۆر لە کەڵەکەبووی مەعریفی کە لە ناو هەناوی کەلەپووری ئەقڵی و نەقڵیی ئێمەدا هەن، دوای گەڕان و لێکۆڵینەوە گەیشتمە قەناعەت لەسەر کۆمەڵێك مەسەلە کە پێشینەکانمان قسەیان لەسەر کردووە و پێیان وابووە کۆتاییان پێهێناوە و چوونەتە بنج و بناوانی، ئەوانەی دوای ئەوانیش گێڕاویانەتەوە، وادیارە خۆشیان پێوە هیلاك نەکردووە، تەنها بە تەحقیق و هەندێ ڕاستکردنەوە و بڵاوکردنەوەی نەبێ و شیعاریان ئەوەبووە

کە "پێشینەکانمان هیچیان نەهێشتۆتەوە بۆ دواییینەکان"، لەمەشەوە ئیسلام باجەکەی داوە بە هەڵگەڕانەوەی کۆمەڵێکی زۆر لە ڕۆڵەکانی، هەروەها شوێنکەوتنی ئەفکارە پووچ و ئایدیۆلۆجیا ماوەکان و پاشەڕۆی هەندێ بنەما و بیرو بۆچوون.

پێشتریش پێشەکیەکم بۆ کتێبەکەی هاوڕێم (راشد الغنوشي) نووسی کە ناونیشانی کتێبەکەی (حقوق المواطنة – مافەکانی هاوولاتیبوون) بوو، هەولّم دابوو لایەنە جیاوازەکانی (پرۆژەی مانەوەو بەردەوامیی ئیسلامی هاوچەرخ) ڕوون بکەمەوە، کە بەردەوام لە تەنگژەدا دەبێ هەتاکو کۆمەڵێك شتی گرنگ و هەستیار بۆ پێشڕەوانی ئیسلامیی قسەبەدەست ڕوون دەبێتەوە، کە لە مێژوومانداهەن، لە دوای ئەوە شەن و کەو دەکرێن، هەروەها ئەو هەڵگۆستنە (إجتهاد) لاوەکیانە لە بەرامبەر ئەو کێشەو بابەتانەی کە دژانی ئیسلام ڕووبەڕووی پێشەوایان و قسەڕۆیشتووانی دەکەنەوە، دادیان نادا، هەروەکو هەولّدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەری لێکنزیککردنەوە و تەئویلکردنی تەوفیقیی لەگەڵ فیکر و ئایدیای بەرامبەر چارەسەر نییە.

ئەو کەسە زۆر خزمەتی ئیسلام ناکا، کە دێت هەڵگۆستن دەکات بۆ ئەوەی واز لە مەزهەبی شەرعزانان بهێنێ و بگاتە ئەنجامێك لە بارەی دابەشکردنی هاوولاتیان لە (دار الاسلام)دا، بۆ (مسوڵمانان) کە لە خاکی ئیسلامدا دەژین بە ئاسایش و ئارامی، هەروەها (نامسوڵمانان) کە لە خاکی ئیسلامدا دەژین بە هۆی پارێزگاریی مسوڵمانانەوە، بێت و ئەم بابەتە بەراورد بکات بە چەمکی (هاوولاتیبوون)ی هاوچەرخ بە هەموو پاشکەوتەکانیەوە لەم سەردەمەدا[1]،

---

[1]. بگەڕێرەوە بۆ پێشەکیەکەمان بۆ کتێبی شێخ راشد غەننوشی (حقوق المواطنة: حقوق غير المسلم في المجتمع الإسلامي).

ئەمە تەنها لەبەر ئەوەی دەرگا والاّ بكات لە بەردەم ئەقڵی مسوڵماندا كە چەمكی هاوولاّتیبوون پیادە بكات، كە لە چوارچێوەی دەوڵەتی نەتەوەیی هاوچەرخی ئەوروپادا لە دایك بووە و بە حازری بۆ ئێمە نێردراوە.

یاخود كەسێك پێیوابێ كێشەی ئەم ئوممەتەی چارەسەر كردووە كاتێك دێت و هەڵگۆستن دەكا بۆ ئەوەی چەمكی (دیموكراسی) بە هەموو پاشكەوتە و ڕیشە لیبڕاڵیەكانیەوە پیادە بكات، بەبێ ڕاستكردنەوەی كۆمەڵە فیكرێك كە لە ڕابردووەوە بۆمان ماوەتەوە و سەری كێشاوە بۆ بلاّوبوونەوەی دیاردەی تاكڕەویی و ستەم و دەستبەسەراگرتن لەم ئوممەتەی ئێمەدا، نەك تەنها لە ئێستادا بەڵكو لە ڕابردووشدا، هەر خوا خۆشی دەزانێت تا كەی بەردەوام دەبن لە لەناوبردن و دەستبەسەراگرتنی داهاتووماندا[1]. پێویستیش ناكا مسوڵمانان چەمكی (پلورالیزم – فرەیی) بە هەموو شێوەكانیەوە وەرگرن، تا ئەو سیستمە فیكریە ڕاست نەكەنەوە كە بووەتە هۆی دەمارگیریی نارەوا و گەڕانەوە بۆ سەرەتاكانی یەكتر ڕەفزكردن، كە ئیسلام ڕزگاری كردین لێی، هەروەها ڕەتكردنەوەی ڕای جیا هەر چیەك بێت با لە شتێكی زۆر لاوەكیشدا بێت.

بە دڵنیاییەوە چارەسەری كێشەی مسوڵمانان بەوە ناكرێ، كە شێوازی بەراوردكردن و لێكنزیككردنەوە و تەئویلكردن و ڕاستكردنەوەی كەم و كورت بگرنە بەر، ئەمە ئەگەر لە ڕووی تیۆریشەوە گونجاو بێت ئەوا ناتوانێت لە

---

[1]. كتێبێك دەرچووە هی هاوڕێی خۆشەویست و شاعیرم (زيد بن علي الوزير)، زۆر كتێبێكی بەپێزە بە ناونیشانی: (الفردية: بحث في أزمة الفقه الفردي السياسي عند المسلمين)، من پێموایە ئەم كتێبە درێژەپێدەری كتێبەكەی كەواكبیە (طبائع الاستبداد) كە دوای نزیكەی سەد ساڵێك بەسەریدا تێپەڕیوە، هەروەها كتێبی (النائینی): (تنبيه الأمة) بۆ ڕوونكردنەوەی ئەوەی كە سروشتی زۆرداریی تا ئێستاش وەكو خۆیەتی و تاكڕەویی بلاّوو بەردەوامە و ئومەتیش لە خەوێكی قووڵدایە، إنا لله وإنا إليه راجعون.

واقیعدا کێشە هاوچەرخەکان چارەسەر بکات، بەڵکو بەردەوامبوون لە سەر ئەم شێوازە، خاوەن پرۆژەکان – بەتایبەت ئیسلامییەکان – دەخاتە تەنگژەوە کە لە تەنگژەی ئەوانیتر کەمتر نابێت، ئەگەر بەردوام بن لەسەر ئەم گۆڕانکاریە جوزئیانە، ئەوا لە کۆتاییدا دەبینن لە چوارچێوەی سیستمێکدان، کە پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەر وەکو پەیوەندی سۆشیالیستەکان و لیبڕاڵیەکان بە دیموکراسی و ئازادی و شیعارەکانی تریانەوە وایە و زیاتر نییە، ئەوانیش تا دەگەنە دەسەڵات ئە دروشمانە بەرز دەکەنەوە، بەڵام کاتێك گەیشتنە دەسەڵات ئەوا جۆرەها تەفسیر و ڕاڤەی بۆ دەکەن، ئازادییەکان سنووردار دەکەن و شتە زۆرەکان کورت دەکەنەوە، بە شێوەیەك کە دیموکراسیەکەیان دەرگای بەندیخانەکان والا دەکات و ئازادییەکان کۆت و بەند دەکات لەگەڵ زۆریی ئازادیدا، هەروەها جۆرەها دەستبەسەراگرتن و سووکایەتی پێکردن و چەوساندنەو و ئەشکەنجەدان پەیڕەو دەکەن.

ئیسلامییەکان پێش هەموو کەس پێویستیان بە خۆ پاککردنەوە هەیە، دەبێ لە خەڵکانیتر زیاتر خۆیان بپارێزن لەوەی بکەونە ناو ئەم جۆرە کارانەوە، هیچ کاتێك ئیسلام مەبەستی نەبووە کۆمەڵێك بە سەر کۆمەڵێکی تردا زاڵ بکات، بەڵکو مەبەستی تەنها ئەوە بووە ئایەتەکانی خوای گەورە بە سەر خەڵکیدا بخوێنرێتەوە و فێری قورئان بکرێن بۆ ئەوەی خۆیان پاك بکەنەوە و دەرباز بن لە هەواو هەوەسی ستەم و زۆرداریی، هەروەها ببن بە جێنشین و ئاوەدانکەرەوەی زەوی و بەندایەتیی خۆیان بۆ خوا دووپات بکەنەوە.

چارەسەری ئەم کێشانە – چارەسەرێکی ئیسلامیانەی بنەبڕ – پێویستی بە دەرچوونی مسوڵمانان هەیە لە تەنگژە فیکرییە بەردەوامەکان کە ماونەتەوە

بۆمـان، لەگـەڵ سـەرلەنوێ داڕشـتنەوەی ئـەقڵی مـسوڵمان بـە شـێوەیەك كـە ببێتەوە بـە ئـەقڵێكی داهێنـەر و هـەڵگۆزەر و خـاوەن بەڵگـە، هـەروەكو چـۆن ئەقڵێك بوو كە خاوەنی پەیامەكەمانﷺ دایڕشتبوو، بە قورئانی بەرز و هەر بۆ ئـەویش دەگەڕایـەوە، ئێـستاش دەبـێ بـۆ پێغەمبـەرﷺ بگەڕێینـەوە لـەم ئەركەماندا.

كاتێـك وەحـی خوێنـدراو (قورئـان) و دەسەوسـانكاری بێبـاوەڕان بـە بچووكترین سورەت و ڕوونكردنەوە و تەفسیری كۆتای پێغەمبەرانﷺ دەبن بە تاكـە سەرچـاوە، ئەوكاتـە ئـەقڵی مـسوڵمان دەتوانـێ خەسـڵەتە گـشتییەكانی ئیـسلام و مەبەسـتە باڵاكـانی دەرك بكـات، لـە پـێش هەمووشـیانەوە: خـوا بەیەكناسین و نەفس پاككردنەوە و درێژەدان و بەردەوامیی، دوای ئەوانە باقی مەبەستە شەرعییەكان و بەها باڵاكانی ئیسلام دێن وەكو: دادگـەریی، ئـازادیی، ئەمانەتپارێزیی، یەكسانیی و ڕزگـاركردنی مـرۆڤ لـە بەندایـەتیی بەنـدەكان بـۆ بەندایەتی خوای بەندەكان، لە ستەمی ئایینەكانەوە بۆ دادگـەریی ئیـسلام، لـە تەسكیی دنیا بۆ پانتایی دواڕۆژ، هەروەها دۆزینـەوەی خەسـڵەتە گـشتییەكانی ئیسلام و سیفەتەكانی ئومەتەكەی، لەوانە:

یەكــەم: جیهــانیبوونی ئیــسلام و گــەردوونیبوونی، هــەروەها گــشتێتی پەیامەكەی بۆ هەموو مرۆڤایەتی و بۆ هەموو سەردەم و كاتێك، ئەو مەرجانـەی كە ئەم خەسڵەتە پێویستێتی لە پێش هەموو شتێكەوە فراوانیـی و نەرمكێـشی و كرانەوە بە سەر هەموو مرۆڤایەتی و شارستانییەت و كـەلتوورەكانی جیهانـدا و هەرسـكردنیان و تێكـەڵبوونیان و تێپەڕانـدنیان و بەرەوپێـشبردنیان لەگـەڵ خۆیدا.

**دووەم:** دەسەڵات بەدەستی کتێبی خواو هەژموونداریی بە سەر هەرچی غەیری خۆیەتی، تەنها ئەو دەسەڵاتدار و سەرچاوە و داڕێژەری حوکمەکانە، بۆ هەموو بۆچوون و هەڵوێستی مسوڵمان دەبێ سەرچاوە بێت.

**سێیەم:** ئایینی نەرمکێشی و ڕەحمەت، کۆکەرەوەی هەموو ئایینەکانیتر و هەژموندار بە سەر هەموویانەوە.

**چوارەم:** پێغەمبەرایەتیەکی کۆتایی، نوێنەرایەتی هەموو پەیامی پێغەمبەرانی پێش خۆی بکات، ڕێنمونی تەواوی تیابێ، بە شێوەیەك کە مرۆڤایەتی لە دوای ئەو پێویستیان بە هیچ بەرنامەیەکی تر و هیچ وەحیەکی تر نەبێ.

**پێنجەم:** ئوممەتێکی نموونەیی و دەرهاتوو لە نێوان ئوممەتانی تر، دامەزراو بە شێوەیەك بتوانێ پێشڕەوی ئوممەتانیتر بکات بەرەو هەق و ڕاستیی.

بەم شێوەیە خوای گەورە ئەم ئوممەتەی کردووە بە سەرمەشقی خەڵکی و پێشڕەویان بە شێوەیەك کە تەنها پێویستی بە زانایانی خواویست و موجتەهید و بەتوانا هەیە، کە ئاییەنەکە نوێ بکەنەوە بە تێگەیشتنی تازەوە و ئایەتەکان لە شوێنی خۆیان دابنێن لە واقیعدا، یاخود واقیع هاوتا بکەن لەگەڵ بەها باڵاکانی وەحی وەکو (خوا بەیەکناسین و نەفس پاککردنەوە و بەردەوامیی)، جا گۆڕانە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان بەهەر لایەکدا بڕۆن، ئەوان تێگەیشتنی دروستیان بۆ ئایینەکەیان هەبێ، بە شێوەیەك بیپارێزن لە گۆڕانکاریی تێپەڕێنەران و شت دانەپاڵی لە لایەن نەزان و هیچ لەبارانەبووەکان، بشزانن چۆن خەڵکی بە کتێبی خواو سوننەتی پاکی پێغەمبەرەوە دەبەستنەوە لە

هەموو سەردەم و کاتێدا، هەروەها خەڵك بە شێوەیەکی جوان بۆ کتێبی خواو سوننەت دەگێڕنەوە، هەرچەند دوور بکەونەوەو دڵیان ڕەق ببێ.

## لە نێوان ڕەهایی و ڕێژەیی و سەرچاوەکانی شەرعداناندا

هیچ گومان لای بڕواداران بە پێغەمبەران نییە کە پێغەمبەرایەتی کۆتایی هاتووە جگە لە (قادیانی) نەبێ، یاخود ئەوانەی بڕوایان بە پێغەمبەری کۆتایی نەهێناوە و تا ئێستاش چاوەڕوانی پێغەمبەری کۆتایی دەکەن، کە لای گاورەکان مەسیحە و لە لای جولەکەکان موسایە. ئەم قورئانە بە ڕەهایی و کراوەیی ماوەتەوە بۆ هەموو سەردەم و کاتێك و شوێنە جۆراوجۆرەکان، هەر نەوە و ڕۆڵەیەکی مرۆڤ بێت قورئان ئاسۆی نوێی بۆ ئیسلام کێشاوە تا عەقیدەیەکی دامەزراو و جێگیر بمێنێ و بنچینەکانی شەریعەت ون نەبن، هەر ئەو ئاینی خوای باڵا دەستە کە ئەمری بە مرۆڤایەتی کردووە بڕوای پێ بهێنن لە یەکەم وەحییەوە بۆ یەکەم پێغەمبەر تا کۆتا پێغەمبەرﷺ، بەڵام بە تێگەیشتنێکی جیهانیانەی گشتی و بەردەوام لە نوێبوونەوەدا بۆ قورئانی پیرۆز، هەروەها بۆ ژیان و سوننەتی پێشەوای مەزنمانﷺ، کە بە گشتی دەبێتە مەنهەجێك بۆ تێگەیشتن و شوێنکەوتن و دەستپێوەگرتن نەك لاسایی حەرفی و سەرکێڵ، ئیسلام بە کۆتا یاساکانیەوە کە قورئان لە خۆی دەگرێ، ئاینی تاکی خوای گەورەیە کە دوای هاتنی هیچ دینێکیتر قبوڵ ناکات لە بەندەکانی، ئەمەش مانای ئەوەیە کە قورئان هەژموونداری بەردەوامە بە سەر هەموو شتێکدا، بۆیە بۆ هیچ کەسێك نییە لە هەر سات و کاتێکدا بێت کە قسەی خۆی پێش قورئان بخات یان سنوورێك بۆ ماناکانی دابنێ و لە قاڵبیان بدات و ڕێگا بە تێگەیشتنی تر نەدا، ئەگەرنا قورئان ڕەهایی خۆی لە دەست

دەدا و دەبێتە دەقێکی ڕێژەیی و تایبەت بە کات و شوێنێکی دیاریکراو، یاخود مێژوویبوونی دەبێتە هۆی ئەوەی دەست بە سەر ماناکانیدا بگیرێ و ملکەچی تەئویل و لێکدانەوەی مرۆڤ و کات و شوێن و داب و نەریت و کەلتوور و ڕووداو بێت.

لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ مانا ڕەهاکانی قورئانی سنووردار نەکردووە بە لێکدانەوەیەکی کۆتایی لە لایەن خۆیەوە[1]، بەڵکو بە سوننەت و مێژووی خۆی حوکم و فەرمانەکانی قورئانی چەسپاندووە، بە شێوەیەك مەنهەجیەتی شوێنکەوتن و پیادەکردنی ڕوونکردۆتەوە کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە، ئەمە کە پەیوەندی بە ئایەتەکانی ئەحکامەوە هەیە یەك لە دوانزە ئایەتی

1. پێغەمبەر ﷺ هیچ تەفسیرێکی لە لایەن خۆیەوە نەنووسیوە بە مانای زاراوەیی تەفسیر – وەکو هەندێك بۆچوونیان وایە –، تەنها هەندێ ئایەتی کەم نەبێت کە جیبریل – علیه السلام – فێری کردووە، جگە لەمە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ قورئاندا سوننەت و ژیانی خۆی بۆ بەجێ هێشتووین، سوننەت و تەفسیر هەریەکەیان تێگەیشتنی خۆیان هەیە، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی تەفسیر بکردایە و ماناکانی لێك بدایەتەوە، ئەوا بۆ هیچ کەسێك نەبوو کە لێکدانەوەی قورئان بکات، جگە لەو تەفسیرە نەبێ کە پێغەمبەر ﷺ خۆی کردوویەتی، هەموو ئەوانەی تەفسیریان کردووە لە هاوەڵان و تابیعەکان و ئەوانە شتێکیان لێوە وەرگیراوە وەکو تەفسیر دەکەوتنە ژێر بەڵێنی سزای پێغەمبەرەوە ﷺ، پاشان تێڕامان و لێوردبوونەوە لە قورئان چ سوودێکی دەبوو ئەگەر ئەو کەسەی قورئانی بۆ دابەزیوە هەمووشی تەفسیر بکردایە؟ یان چۆن شەرعزانان و ئەهلی ڕاو بۆچوون و فەرموودەناسان ئەم هەموو ڕایە جیاواز و مەزهەبە جیایانەیان دەبوو ئەگەر تەنها یەك تەفسیر بۆ قورئان بکرایە، بە شێوەیەك کە هەندێکیان دەیان و سەدان مەسەلەیان لە تەنها ئایەتێکەوە وەرگرتووە، ئایا پێغەمبەرﷺ ئەمانەی هەموو لە تەفسیرەکەیدا باس کردووە، ئیمامی ڕازی لە پێشەکی تەفسیرەکەیدا دەڵێ ئەگەر بمویستایە تەنها لە سەر سورەتی (فاتحة) قورسایی باری حوشترێکم دەنووسی و هێشتا ماناکەشی تەواو نەدەبوو، ئایا ئەم و هاوشێوەکانی مەبەستیان لەوە ئەوە بووە کە تەفسیرێك لە پێغەمبەرﷺەوە بگێڕنەوە؟ ئایا حوکمی ئەوانە و تەفسیرەکانیان کە هەزاران تەفسیر دەبێ چییە؟ ئەگەر تەفسیرێکی پێغەمبەرﷺ هەبێ و ئەوان تێیان پەڕاندبێ؟ ئەی ئەوانەی کە قسەی هاوەڵان و تابیعەکانیان وەرگرتووە لە تەفسیردا؟ بێگومان جیاوازی زۆرە لە نێوان سوننەت و تەفسیردا، سوننەتی پێغەمبەرﷺ بریتییە لە قسەو کردەوەو دانپیانانەکانی کە ئەمانەش بەیانکردنی قورئانن، بەڵام ئەمە ناونانرێ تەفسیر، والله أعلم.

قورئانه (واته له هەر دوانزه ئایەت یەکێکیان تایبەته به ئەحکامی شەرعیەوه)، بەڵام سەرجەم ئایەتەکانی تری کردووه به ئایـەتی کـراوه و ڕەهـا، کـه هـەموو شوێن و کاتێك دەگرێتەوه، خەڵکی له هەموو سـەردەمێکدا دەتـوانن سـوودیان لێـوەرگرن و مانایـان بکـەن بـەوەی کـه خـوا بۆیـان ئاسان بکـات، تێڕامـان و لێکۆڵینەوه لـه ئایەتـەکانی قورئـان مـافی هـەموو کەسـێکی شـارەزایه، بـەڵکو واجبیــشه لەســەری، ســوننەتی پــیرۆز – جگــه لــه لایەنــەکانی ئــەحکام و ڕوونکردنەوەی پێویست و ڕاستەوخۆ – لـه ڕووی پڕاکتیکیـەوه پیـادەکردنێکی تێـرو تـەواو و ئەپـەڕی تێگەیـشتنی ورده، لـه ڕووی دانپیانـان و گوتاریـشەوه، باشـترین ڕوونکـەرەوه و شـیکەرەوەی ئایەتـەکانی قورئـانی بـه پێـزه، کـه بـه گــشتی وایکــردووه ســوننەتی پێغەمبــەر ﷺ باشــترین مەنهــەج بێــت بــۆ شوێنکەوتن، دەبێ ئێمه ورد بین لـه تێگەیـشتن لـه شـوێنەکەوتن و شـوێن پـێ هــەڵگرتن لــه بەرامبــەر لاســاییکردنەوەدا، هەرچـی شـوێنکەوتنه ئـەوا لەســەر بنەمای بەڵگه و دەلیل، زانیـاری، تێگەیـشتن و دەرککـردن دادەمـەزرێ، بـەڵام لاسایی ئەوا دووبارەکردنەوه و بەدواداچوونه بێ گوێدانه بەڵگه و بورهان.

دوای ئەمه له بەرامبەر ڕەهایی قورئاندا هەموو مێژوومان دەکەوێته خانـەی ڕێژەییبوونـەوه، بـەهۆی کاریگـەریی کـات و شـوێن و کـەلتووره تایبەتیـەکان، هــەروەها بــاری کۆمەڵایــەتی و فیکریــی کــاری تێدەکــەن، کاتێـك دەرك بەمــه دەکــەین بــه شـێوەیەکی بابەتیانــه، لەگــەڵ تێگەیـشتنمان لــه تایبەتمەندیـه نـەمرەکانی پـەیامی پـیرۆزی ئیـسلام بـه ئەقڵیـەتێکی گـشتگیرەوه، کـه ئـەو ئەقڵیەتــه توانــای تێگەیــشتنی چــەمکه باڵادەســتەکان و مەبەســت و داوا شەرعییەکانی هەبێ، ئەوا دەتوانین زۆر و زۆرتـر لـه شـوێن و خاڵـه لاوازەکـانی

کەلەپوور و مێژوومان تێبگەین، هەروەکو دەتوانین زۆرێك لە خاڵە بەهێزەکان دیاری بکەین.

لێرەوە دەکرێ لە زانستی تەفسیردا (ئیسرائیلیات)[1] وەك ترسناکترین خاڵی لاواز دیاری بکەین کە تووشی ئەم زانستە بووە، هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە، وە ئەمە تیایدا ڕۆچووە و کاردانەوەی سلبیشی هەبووە لەسەر زانستەکانی قورئان، هەر لە سەردەمی نووسینەوەیەوە تا ئێستا، بەڵێ ڕاستە پێشینەکانمان وزە و توانایەکی گەورەیان خەرج کردووە لە پێناو بەرەنگاربوونەوەیدا، بەڵام بێگومان هەندێکیان کاریگەریی سەلبیی خۆیان بەجێ هێشتووە، لە فەرموودەدا دەتوانین ئەوە دەرخەین کە زۆرێك قسەی درووستکراو بە دەستی ئەنقەست خزێنراونەتە ناو فەرموودەکانەوە، کە هەندێکیان تەنانەت لە پرەنسیپ و پێوەرەکانی زانایانی فەرموودەش ڕەت بوون و چوونەتە ناو کتێبەکانەوە، ئەمانە ڕۆڵی خراپیان بینیوە لە شەقکردن و دووبەرەکیی ئوممەتەکەماندا، یاخود لە یاسا ئوصولی و حوکمە شەرعیەکاندا دەتوانین کۆمەڵێك پاشماوەی بەرنامەکانی ئوممەتەکانی پێشوو ببنین کە قورس و گران بوون و ئاینی ئێمە لایبردوون بە ڕەحمەتو ئاسانگیریی خۆی، هەموو ئەمانە بۆ ئەوەی ئەهلی زانست لە زانایانی بۆ خوا سوڵحاو ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن، هەروەها بۆ ئەوەی بەردەوام لە ناوەندەکانی زانستی شەرعییدا چاوگێڕان و بەدواداچوون هەبێ بۆ مەسەلەکان، بۆ ئەوەی شتێك کە لە ئیسلامدا نییە نەچێتە ناوی، هەروەها بۆ پارێزگارییکردن لەم دینە و بە پاکیی مانەوەی بۆ باڵادەستبوونی بە سەر هەموو ئایینەکانی تردا، هەروەها بۆ

---

[1]. ئەو خورافیات و ئەفسانانەیە کە تێکەڵی گێڕانەوە و چیرۆکەکان بوون و دوورن لە راستیەوە و هەموو ئەقڵێکی ورد دەتوانێ جیایان بکاتەوە (وەرگێڕ).

ئەوەی کالێککردنی بەردەوام هەبێ لە نێوان قورئان و مرۆڤ و بوونەوەردا، هەتا بوونەوەر هەمووی دەبێتەماڵێکی ئارام بۆ مرۆڤ و بەها باڵاکانی وەکو ڕێی ڕاست گرتن و هەق و ئەمانەت لە هەموو جیهاندا بەردەوام بێت.

## ئێستا ترسناکیی لە کوێوە لە بۆسەدایە بۆ ئیسلام؟

بێگومان خوای گەورە گرنگترینی خەسڵەتەکانی پەیامی کۆتا پێغەمبەرانی دیاری کردووە، کە پەیامی ئیسلام و ئەویش بۆ هەموو جیهان، گرنگترینی خەسڵەتەکانی شەریعەتیشی دیاریکردووە کە بریتیە لە ڕەحمەت و ئاسانگیری، ئەمە تەنانەت لە پێش هاتنی پێغەمبەریشەوەﷺ، ئەم خەسڵەتە – واتە ئاسانگیری و ڕەحمەت – لە هەموو پەیامەکانیتری وەك دوعاکانی ئیبراهیم و تەورات و ئەلواحی موسا و ئینجیلی عیسا و پەیامەکانی تریشدا هاتووە، ئەمەش لە دەروونی مرۆڤایەتیدا جێگیر بووە تا پێش هاتنی پێغەمبەرﷺ، ئەهلی کیتابیش بەو شێوەیە بانگەوازی موشریکەکانی عەرەبیان دەکرد پێش ئیسلام، خوای گەورە گوتاری جیهانیی ئاسانگیر و ڕەحمەت و لابردنی قورسی و گرانیی شەریعەتەکانی پێشووی کردووە بە دوو تایبەتمەندی پێغەمبەرﷺ، جیا لە هەموو پێغەمبەرانی تر، ئەو هەڵگری پەیامی مرۆڤایەتی ئیسلامە و ئاسانکار و ڕەحمەتی گشتگیری تیایە لەسەر بنەمای بەها باڵاکان کە هەموو مرۆڤایەتی تیایدا هاوبەشن.

گرنگترین و دیارترین دەق کە لەو بارەیەوە هاتبێ ئەو ئایەتە پیرۆزانەی سورەتی (الاعراف)ن، کە تیایدا خوای گەورە ڕووداوی هەڵگەڕانەوەی بەنی ئیسرائیلی بە کۆمەڵ تۆمار کردووە، ئەمەشی بە گوتارێکی جیهانیی و باڵادەستبوونی کتێبی خۆی لە ناو سەرجەم خەڵکیدا ڕاگەیاندووە، ئەمە لە

کاتێکـدا کـه کەوتنــه پەرسـتنی گوێرەکـە و دوایـی گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، لەوکاتەدا موسا(علیه السلام) لە پـێش هەموویانـەوە بـوو بـۆ داوای لێبـوردن و لابردنی زەحمەت و قورسی لەسەریان، بۆ ئەوەی دیسانەوە لە بەندایـەتی خـوا وەڕس نەبن و بکەونەوە پەرستنی گوێرەکەیەکی دروستکراو لە ئاڵتوون، بـەڵام خوای گـەورە سـووککردن و ئاسـانکردنی شـەریعەتی دواخـست بـۆ سـەردەمی هــاتنی پێغەمبــەرﷺ وەك دیاریــەك بــۆ مرۆڤایــەتی، ئەمــەش نیــشانەی پێغەمبەرایەتیەکەی بوو، لە سورەتی ئەعرافدا هـاتووە: (وَاخْتَـارَ مُوسَـى قَوْمَـهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِّمِيقَاتِنَا فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ قَـالَ رَبِّ لَـوْ شِـئْتَ أَهْلَكْـتَهُم مِّـن قَبْـلُ وَإِيَّايَ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاء مِنَّا إِنْ هِيَ إِلاَّ فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَـشَاء وَتَهْـدِي مَن تَشَاء أَنتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ* وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَــذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَـا إِلَيْكَ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَـاء وَرَحْمَتِـي وَسِـعَتْ كُـلَّ شَـيْءٍ فَـسَأَكْتُبُهَا لِلَّـذِينَ يَتَّقُـونَ وَيُؤْتُـونَ الزَّكَـاةَ وَالَّـذِينَ هُـم بِآيَاتِنَـا يُؤْمِنُونَ* الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّـيَّ الَّـذِي يَجِدُونَـهُ مَكْتُوبـاً عِنـدَهُمْ فِـي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَـاتِ وَيُحَـرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَـتْ عَلَـيْهِمْ فَالَّـذِينَ آمَنُـواْ بِـهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ* (قُلْ يَا أَيُّهَـا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُـوَ يُحْيِـي وَيُمِيتُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) (الأعراف: ١٥٥ – ١٥٨).

بەم شێوەیە قسەی خوای گەورە تەواو بوو لە هەواڵپێدانـدا و ڕێـك و ڕاسـت بوو لە حوکمـدا و پێغەمبـەریﷺ نەخوێنـدەواری نـارد بـۆ هـەموو خـەڵکی بـە گوتارێکی جیهانی و کتێبێکی سەروەر کـە هـەموو شـەریعەتەکانی پـێش خـۆی

سڕیەوە، ئاسانکار و پـڕ لـە ڕەحمـەت، نەسخی شـەریعەتی گرانـی بـە هـەموو شێوەیەك کـرد، کاتێك جولەکـە ئەمـەیان بـۆ ڕوون بـووەوە، بـەرەو دوورگـەی عەرب کشان، پێش هاتنی پێغەمبەرﷺ بە نزیکەی حـەوت سـەدە، بـۆ ئـەوەی چاوەڕوانی هاتنی ئەو پێغەمبەرە بکەن کە بەڵێنیان پێدرابوو، لەخۆباییبوونیان وای لێکردبوون کە وایان دەزانی تەنها جێگاگوڕینیان دەبێتە هـۆی ئـەوەی کـە پێغەمبەرایەتی لەناو ئەواندا بمێنێتەوە و دەرنەچێ، بەڵام کاتێ ئەمـە وانـەبوو، کەوتنە ژێر گۆڕانی سوننەتی خواوەو دەروونیـان پڕبـوو لـە قـین، و زانیـان کـە ئەوان چیتر گەلی هەڵبژێردراوی خوا نـین و سـەردەمی ڕیزدارییـان بەسەرچـوو، کەوتنـە پیلانـدانان بـۆ ئیـسلام و پێغەمبەرەکـەیﷺ، لـە کاتێکـدا دەیـانزانی بەڕاستی کە ئەوە ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەیـە و وەکـو کوڕەکـانی خۆیـان دەیانناسی: (الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمْ وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) (البقرة: ١٤٦).

دوای ئەوە ڕقەکەیان گۆڕا بۆ پـیلانگێڕی بـە هـەموو شـێوەیەك، هەوڵیانـدا نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی سووك بکـەن و بیگـۆڕن، لـە پـێش هەمووشـیانەوە داڕنینی سیفەتی ئاسانگیریی و ڕەحمەت لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام کە ئاسـانتر بـوو لـە ئایینـەکانی پـێش خـۆی، هـەروەها بـەرپاکردنی جۆرێـك لـە تەمومـژ سەبارەت بە ڕەهایی قورئان و پاراستنی دەقەکانی لە لایەن خوای گەورەوە[1]، هەروەها شـێواندنی بەشـێك لـە سـیفەتی ئاسـانکاریی شـەریعەت، بـۆ ئەمـەش

[1]. وەسفی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد بەوەی کە شەڕکەرێکی باشە، خاوەن هێزو بازووە، چەندین داستانی قارەمانێتی هەیـە، بۆیـە ئـەو پێغەمبـەری قارەمانیەتەکانـە نـەك پێغەمبـەری ڕەحمـەت، کـە ئەمـەی دووەمیـان خەسـڵەتی جیاکەرەوەی پێغەمبەرەﷺ لە باقی پێغەمبەران، هەروەها نکوڵیان دەکرد لەوەی کە دوایین پێغەمبەر بێت، چونکە دەیانوت دوایین پێغەمبەرﷺ بە ڕەحم و بەزەییە و پەیامەکەشی هەروایە، قورئانی پیرۆزیـش ئەمـەی لـە چـەندین

ئەمەش کۆمـەڵێك قـسە و قـسەڵۆکیان داهێنـا دەربـارەی پـیرۆزی و پاراسـتنی قورئان و چۆنیەتی کۆکردنەوە و ڕێکخـستنی، بـۆ کەمکردنـەوە لـە هـەژموونو پیرۆزیی قورئان لە ژیانی مسوڵمانانەدا، وەك ئەوەی کـە کتێبێـك نـەبێ پـارێزراو بێت لە لایـەن خـواوە و پووچـەڵی لـە هـیچ لایەکیـەوە تێکـەڵی نـەبووبێ، نـەك هەرئەوە بەڵکو کەوتنە تانە و تەشەردان لـە پـاکیی پێغەمبـەرﷺ بـە جۆرەهـا ئامراز و ڕێگا[1]، وەك خـوای بـەرز و بـاڵا دەفـەرموێ: (وَقَالَـت طَّآئِفَـةٌ مِّنْ أَهْـلِ الْكِتَـابِ آمِنُـواْ بِالَّـذِيَ أُنـزِلَ عَلَـى الَّـذِينَ آمَنُـواْ وَجْـهَ النَّهَـارِ وَاكْفُـرُواْ آخِـرَهُ لَعَلَّهُـمْ يَرْجِعُونَ* وَلاَ تُؤْمِنُواْ إِلاَّ لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ الْهُـدَى هُـدَى اللّـهِ أَن يُـؤْتَى أَحَـدٌ مِّثْلَ مَا أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ قُلْ إِنَّ الْفَـضْلَ بِيَـدِ اللّـهِ يُؤْتِيـهِ مَـن يَـشَاءُ وَاللّـهُ وَاسِـعٌ عَلِـيمٌ* يَخْـتَصُّ بِرَحْمَتِـهِ مَـن يَـشَاءُ وَاللّـهُ ذُو الْفَـضْلِ الْعَظِـيمِ) (آل عمران:٧٢ – ٧٤).

## چۆن جوولەکە توانی دزە بکاتە ناو فەرهەنگ و کەلەپووری ئیسلامیمانەوە؟

جوولەکە لە سەرەتاوە لەو ئایەتانەوە دەستیان پێکرد کـە دان دەنـێن بـە کتێبە ئاسمانییەکانی پێش قورئان، کە تەوراتیش یەکێکە لـەوان: (وَآمِنُـواْ بِمَـا أَنزَلْتُ مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَكُمْ وَلاَ تَكُونُواْ أَوَّلَ كَـافِرٍ بِـهِ وَلاَ تَـشْتَرُواْ بِآيَـاتِي ثَمَنـاً قَلِـيلاً

---

شوێندا دوویات کردۆتەوە: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ) (الأنبياء: ١٠٧)، هـەروەها (لَقَـدْ جَـاءَكُمْ رَسُـولٌ مِّـنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) (التوبة: ١٢٨).

[1]. لەوانە دەیانوت ئێمە سیحرمان لە پێغەمبەرﷺ کردووە بە شێوەیەك کـە کاریگـەریی سـیحرەکە لـە هـەڵس و کەوتیدا دیارە، بۆیە وادەزانێ کە کارێك دەکات بەڵام ئەو نەیکردووە، زۆر شتی تریش، بەڵام بیریان چـووبووەوە کـە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ) (المائدة: ٦٧)، خوای گەورەش بەڵێنی خۆی جێبـەجێ دەکـاتو واز لە پێغەمبەرەکەی ناهێنێ بۆ جادووی جوولەکەو گاڵتەپێکردنی.

وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ) (البقرة: ٤١)، هەروەها (وَمُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ) (آل عمران: ٥٠)، ئەوان تەفسیری دانپیانان (التصدیق)یان بە ڕازیبوون و دووپاتکردنەوە و شوێنکەوتن کردووە، بەمەش تەوراتیان کردووە بە سەرچاوە و مەرجەعی قورئان بە چاوپۆشی لەو گۆڕان و دەسکاریە زۆرانەی کردوویانە تیایدا، بە شێوەیەك کە ئێستا موسا (علیه السلام) سەیری بکات نایناسێتەوە و ئینکاریی لێدەکات، هەروەها ئەوەشیان پشتگوێ خستووە کە قورئان تەوراتی هەڵوەشاندۆتەوە و حوکمەکانی نەسخ کردۆتەوە، ئەوان بڕوایان بە نەسخبوونەوەی تەورات نییە، یاخود هەر قبوڵی ئەگەرێکی لەو بابەتە ناکەن، بێگومان ئەوان بێئاگان لەوەی کە ئەو دانپیانان و باسکردنەی قورئان بۆ کتێبە ئاسمانییەکانی پێشوو ئەوە دووپاتکردنەوەی شتە نەگۆڕو چەسپاوەکانی ناو هەموو شەریعەتەکانن کە لە پەیامی هەموو پێغەمبەراندا هاتوون و هاوبەشن تیایدا، وەکو باوەڕ بە خوا و یەکخواناسی و تەنها خواپەرستی لە پەرستن و پەروەردگاریێتی و ناسینی سیفەتە بەرزەکانیدا، هەروەها قورئان هەژموونی هەیە بە سەریاندا و سەرجەم ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر ئەو پەیامانەدا هاتوون، قورئان پوختەی کردوونەتەوە و کرۆکیانی لەخۆ گرتووە، کەواتە سەرچاوە و ناوەندی هەموو ئەو کتێبانەیە نەك بە پێچەوانەوە، کەواتە ئەوە دانپیانانێکە پەیوەستە بە باڵادەستیی قورئان و لابردنی کۆت و قورس و گرانیی شەریعەتەکان، چونکە ئەوان شەریعەتی پەروەردەکردن و سزادان بوون: (فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ اللّهِ كَثِيراً) (النساء: ١٦٠)، بەڵام ئەوەی کە قورئان دانی ناوە بە شەریعەتەکانی پێش خۆی و تەنها ئەو کارایە لە دوای ئەوان، ئەوا دەفەرموێ: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا

أنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم..) (المائدة: ٤٨).

کەواتە قورئان پشتڕاستی پەیامەکانی پێش خۆی کردۆتەوە و بالادەستیشە بە سەریاندا، ناگۆڕدرێ و تواناداره بە سەر هەموو ئەو شتانەی کە تیایدایەتی، لابەری کۆت و بەند و قورسییەکانی پێش خۆیەتی، بەلام ئەم پشتڕاستکردنەوەیە ئەوە ناگەیەنێ کە بە تەواوەتی تەسلیمی خاڵ بە خاڵی شتە گۆڕاوو دەسکاریکراوەکانیشە، بەڵکو هاتووە حەقیقەتی شتە گۆڕاوەکانی دووپات کردۆتەوە، واتە شتە ئەسڵیەکانی چەسپاندۆتەوە کە پێش گۆڕان لەو پەیامانەدا هەبوون، شتە چەسپاوەکانیشی هێناوەتەوە کە هەموو پەیامەکان تیایدا هاوبەشن: (فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ وَلاَ تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىَ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمُ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) (المائدة: ١٣).

کەواتە دانپیانانەکە گێڕانەوەی ئەو ئایینە گۆڕاوانەیە بۆ سەر ئەسڵ و بنج و بناوانەکەی خۆیان کە چۆن لای خوای گەورەوە هاتوونەتە خوارەوە، نەك ڕازیبوون بەو گۆڕان و دەسکاریکردنانەی کە تیایاندا ڕوویداوە، بەدەستی خۆیان شتیان بۆ زیاد کردووە و نووسیویانەتەوە، ئەمەش تایبەت بە قورئانەوە چوونکە ناگۆڕدرێ و دەسکاری ناکرێ، کەواتە بەمەش ئایینە ئاسمانیەکانی پێشوو حەقیقەت و ڕاستێتی خۆیان وەردەگرنەوە (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر: ٩)، وشەی (الذكر) لێرەدا مەبەست لێی ڕەهایە و هەموو ڕاستیە هاوبەشەکانی نێوان قورئان و کتێبە ئاسمانیەکان دەگرێتەوە، کە ڕاستیگەلێکی دیاریکراون و گۆڕان و دەسکاری کردن قبوڵ ناکەن، وەك یەکخواناسی و بەها هاوبەشەکان، بۆیە بە هۆی هاتن و هەژموونی قورئانەوە

ئـەو کتێبانـەش پـارێزراو دەبـن چـونکە بنـچینەکانیان لـە قەرئانـدا هـاتووە و پەیامی کۆکراوەی هەموو پێغەمبەرانی تێدایە و پارێزراویشە (وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقاً وَعَدْلاً لاَّ مُبَدِّلِ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) (الأنعام: ١١٥)، بە دانپیانـان و هەژموون، وە ڕاستگۆیی لە هـەواڵ و بابەتەکانـدا و دادگـەریی لـە حـوکم و بـاڵا دەستی گشتی دا.

جوولەکە لە چـەمکی پـشتڕاست کردنـەوەوە دەسـتیان پێکـرد و ماناکـەیان گۆڕی و بە پێچەوانەوە لێکیان دایەوە، بۆ ئەوەی کەلەپووری خۆیان بسەلمێنن و نەکەونە ژێر هەژموون و دەسـەڵاتی قورئانـەوە، و پایـە و بنـەماکانی خۆیـان بهێڵنەوە، بەمەش کتێب و سیفرەکانی خۆیان بە هەموو گـۆڕان و تێکدانێکـەوە کرد بە سەرچاوە و بنچینەی قورئان و تەفسیرکەری سـەرەکی ئایەتـەکانی، لـە دوای ئەمەوە هیچ جێگای سەر سوڕمان نییە کە کۆمەڵێکی زۆر لە ئیسرائیلیات دزە بکاتە ناو فەرهەنگ و مەعریفەمانەوە بە جۆرەها شێوە تا وای لـە هەنـدێك لە زانایانی ئوسوڵ کردووە کە یاسایەك پیادە بکەن کە دەڵێ (شەرعی ئەوانەی پـێش خۆمـان شـەرعی ئێمەیـە مـادام ڕەتکەرەوەیـەك نـەبێت)[1]، واتـە هـەر ڕەتکەرەوەیـەکی لاوەکـیش بێـت بـەڵام چاوپۆشـیان لـەو هـەموو قـسەو باسـە کردووە کە لەسەر ئەم یاسایە هەیە و دەربارەی وتراوە.

جوولەکە بە هـەر شـێوەیەك توانیبێتیـان هـەوڵیان داوە دەسـت بخەنـە نـاو قورئانەوە، بە ئامـانجی ئـەوەی وەکـو بـاقی کتێبـە ئاسمانیـەکانیتر بیگـۆڕن و دەسکاریی بکەن، هەروەها تایبەتمەندی شەریعەتەکەی بگۆڕن، بـۆ ئـەوەی لـە شـەریعەتی ئاسـانکار و ڕەحمەتـەوە بیکـەن بـە شـەریعەتی کـۆت و بەنـد و

---

[1]. سەیری ئەم یاسایە و قسەی زانایانی ئوسوڵ بکە لەبارەیەوە لە کتێبی: (المحصول للرازي)دا، هـەروەها باسـێکی ئێمە لە کۆمەڵە وتاری فیقهیدا چاپکراوە بە ناونیشانی (مقاصد الشريعة).

قورسی، هەروەکو هەوڵیانداوە بچنە ناو دەقی پیرۆزی قورئانەوە و دزە بکەنە ناو ئایەتەکانیەوە بە هیوای ئەوەی شتێك بکەن بۆ گۆڕینی، هەروەکو ئەوەی بەسەر کتێبەکانی خۆیانیان هێناوە، بەڵام بینیان کە لەناو خۆیدا پارێزراوە بە هۆنینەوە و شێواز و ڕەوانبێژیەکەی و لەناو دڵی ملیۆنان کەسدا بە موعجیزەکانیەوە پارێزراوە، ئەمە سەرەڕای چەندان نوسخەی چاپکراو لێی کە ناتوانرێ دەسکارییان بکرێ، بۆیە جوولەکە لەمبارەیەوە هیچی بۆ نەکرا و پاشەوپاش گەڕانە دواوە، سەرشۆڕیی نەبێ هیچیان بۆ نەمایەوە، ئەگەر شەیتان بێئومێد بووبێ لەوەی کە لە دوورگەی عەرەبی بپەرسترێ و بە غەیری ئەوێ ڕازی بووبێ، ئەوا جوولەکەش دەستی لە قورئان بەردا و وازی لە هەوڵی گۆڕینی هێنا کە خوای گەورە بە گەورەیی خۆی و بە نووری قورئان و هۆنینەوەی و شێوازو ڕەوانبێژیەکەی پاراستی، ئەوا ڕوویان کردە تەفسیر و لەو دەرگایەوە دەستیان درێژ کرد و چەندین تەفسیر و تەئویل و گێڕانەوەی نادروستیان تێکەڵکرد، بە بیانووی ئەو لە یەکچوونە ڕووکاریەی لە نێوان هەندێ چیرۆکی قورئان و بابەتی ڕۆژی دوایی و تەوراتدا هەیە، هەروەها ئەو شتانەی کە هاوبەشن لە نێوان قورئان و تەوراتداو باس لە دروستبوون و بوونەوەر و مرۆڤ و چۆنیەتی ڕۆژی دوایی و هەندێ بابەتی تری ورد دەکەن، کە مێشکی خۆیانیان پێوە خەریك کردبوو خەیاڵی نەخۆشیان پێیەوە دەتلایەوە بۆ ئەوەی شتێك بگۆڕن لە تایبەتمەندیەکانی ئەم دینە.

## ئامانجەکانی جوولەکە

لە سەرەتاوە ئامانجی جوولەکە بەرگرییکردن بوو، دەیانویست ڕێگا بگرن لە ڕۆڵەکانی جوولەکە تا نەچنە ناو ئیسلام و مسوڵمان نەبن، بڕوا بە پێغەمبەر

و پەیامەکەی نەهێنن، بۆیە هەموو هەوڵێکیان خستە گەڕ بۆ قەناعەتپێکردنی ئەوانەی شارەزاییان لە تەوراتدا هەبوو کە ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەی لە تەوراتدا ناوی هاتووە و لە سەر شاخ مژدە دراوە بە موسا بە هاتنی ئەو، ئەم موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا نییە، لەمبارەیەوە هیچ ڕێگایەك نەما نەیگرنە بەر، هەموو توانایان لەو پێناوەدا دەخستە کار بە تایبەتی توانای (ئەحبارەکان)یان و زانایانی ئایینیان، بۆیە هەستان بە گۆڕین و لابردن و زیادکردنی سیفەت و وەسفەکانی پێغەمبەرﷺ کە لە تەوراتدا هاتبوون، بە تایبەتی دەربارەی (جیهانیبوونی پەیامەکەی و سووك و ئاسانکاریی و ڕەحمەت، نەخوێندەواری لە بنەڕەتدا هەروەك خوای گەورە لە سەر شاخەکە بە موسا (علیە السلام) و حەفتا پیاوەکەی لەگەڵیدا بوون ڕاگەیاند)، ئەوەی نەیانتوانی بیگۆڕن کەوتنە تەئویلکردنی و زیادکرنی ڕاڤە و لێکدانەوەی (تەلموود و تەورات) بە شێوەیەك لەگەڵ خواستەکانیاندا بگونجێ.

بۆیە یەکەم ئامانجیان بەرگرییکردن بوو تیاشیدا سەرکەوتن بە باشی، بە جۆرێك کە تەنها چەند کەسانێکی کەم لە جوولەکەییەوە بوون بە مسوڵمان.

بەڵام ئامانجی دووەمیان بریتی بوو لە درزەکردنە ناو بەرەی مسوڵمانان لە ناو خۆیاندا، ئەمەش بە چەندین شێوە و جۆری جیاواز، لەوانە ئەو هەوڵەی کە قورئان تۆماری کردووە: (وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمِنُواْ بِالَّذِيَ أُنزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَجْهَ النَّهَارِ وَاكْفُرُواْ آخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ* وَلاَ تُؤْمِنُواْ إِلاَّ لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ الْهُدَى هُدَى اللّهِ أَن يُؤْتَى أَحَدٌ مِّثْلَ مَا أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ قُلْ إِنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ) (آل عمران: ٧٢ – ٧٣)، ئەگەر ئامانجی یەکەم لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا چالاك بووبێ و برەوی پێدرابێ، واتە ئامانجی بەرگرییکردن، ئەوا ئامانجی دووەم لە دوای

ئەوە و لە مەدینەو لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا زۆر کاری لەسەر کراوە، دوای بەرفراوانبوونی خاکی مسوڵمانان چالاکیی ئەم ئامانجەش فراوانتر بـوو تـا هـەموو ئوممـەتی ئیـسلامیی بگرێتـەوە بـە جیـاوازیی ڕەچـەڵەك و کـەلتوور و ڕەنگەوە و لە هەموو لایەکیشەوە.

## سازکردنی دەروازەکانی ساختەکاری لەلایەن جوولەکەوە

هەر کۆمەڵێکی سـاختەکار و گێرەشـێوێن بێگومـان دەبـێ کۆمـەڵێك دەرگـا بکاتـــەوە لـــەو بنیاتـــە فیکریـــەی کـــە دەیـــەوێ دزە بکاتـــە نـــاو سیـــستمی مەعریفیەکەیەوە و کاری خۆی تیا بکا، بۆ ئەوەی لێیەوە کار لەسەر مەرجەع و سەرچاوە سەرەکیەکەی بکات تا گـۆڕان و سـاختەکاریەکانیش جێگـای خۆیـان بگرن و ببنە سەرچاوە و لێیانەوە هەموو شتێك بکرێ.

بێگومان لادان لە چەمکی ئـەوەی کـە قورئـان پـشتڕاستی کتێبـەکانی تـری کردۆتـــەوە و تێنەگەیـــشتن لـــەوەی کـــە قورئـــان بـــاڵا دەســـتە بەســـەریاندا و هەموویانی نەسخ کردۆتەوە، وە بێئاگایی لە پرەنسیپەکانی پاراسـتنی قورئـان بۆ ئەو شتانەی لـە پـێش ئـەودا هـاتوون ئاکـامی خراپـی هەیـە لەسـەر فیکـر و مەعریفەی ئێمە وەکو مسوڵمان، ئەگەر وانییە ئەی چۆن زانایـانی ئوسـوڵ ئـەو یاسایەیان دادەنا کە (شەریعەتی ئەوانەی پـێش ئێمـە – واتـە ئومـەتانی پـێش ئومەتی ئیسلام – شـەریعەتی ئێمەیـە مەگـەر هەڵوەشـێنەرەوەیەك هاتبـێ لـە ئیسلامدا)، بەمەش هەڵوەشاندنەوەی سەرتاسەریان بۆ ئایینەکانی تـر لەلایـەن ئیسلامەوە لە بیرکردووە، ئـەوەیان بـیر مـسوڵمانان بردۆتـەوە کـە ئیـسلام بـە گشتی هەموو پەیامەکانی پێش خۆی هەڵوەشاندۆتەوە و وایان کردووە خەڵکی بـەدوای شـتی لاوەکـی و بـچووکدا بگـەڕێن کـە ئـاخۆ کامیـان لـە ئیـسلامدا

هەڵوەشاوەتەوە؟ لەمەشەوە هەندێ کەس فیقهێکیان داهێناوە کە ئایینەکانی تریش بە شێك بن لە فیقهی ئیسلامی هەروەکو حوکمی هەندێ بابەتی وەکو بریندارکردن و لێدانیان لەم ئایەتەوە وەرگرتووە کە باسی بەنو ئیسرائیل دەکا (وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلاً لِّكُلِّ شَيْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُواْ بِأَحْسَنِهَا سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ) (الأعراف: ١٤٥)، ئەمە باشترین نموونەیە و شتی تریش زۆرە لە بابەتە فیقهیە جۆراو جۆرەکاندا، وەکو ژن و ژنخوازی لە نێوان مرۆڤ و جنۆکەدا و زۆری تر کە دەرگایەکی کردۆتەوە لە مسوڵمانان تا ئێستاش دانەخراوەتەوە[1].

## دزەکردنە ناو فەرموودە و هەڵبەستنی

بەڵام لە بواری فەرموودەکانی پێغەمبەردا ئەوا سەرەتای دزەکردنەناوی لەو کاتەوە بوو کە ئەو فەرموودەیە بڵاوبووەوە لە ناو خەڵکیدا کە (بخاري وترمذي) لە (عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص)ەوە گێڕاویانەتەوە و دەفەرموێ: (بلِّغوا عنّي ولو آية، وحدِّثوا عن بني إسرائيل ولا حرج، ومن كذب عليّ متعمداً فليتبوأ مقعده من النار)، بوخاری گێڕاویەتەوە[2]، واتە: لەمنەوە بگەیەنن با تەنها ئایەتێکیش بێت، هەروەها باسی بەنو ئیسرائیل بکەن هیچ گوناح نییە، هەرکەسێکیش درۆ بە ناوی منەوە بکات با جێگایەك لە ئاگردا بۆ خۆی دیاری بکات. ئیبنو ئەسیر لە کتێبەکەیدا (جامع الاصول) دەڵێ: (وشەی

---

[1]. بۆ سەیرکردن و شارەزابوون لە نموونەی زیاتر دەتوانرێ سەیری باسەکەی ئێمە بکرێ بە ناوی (الفقه الموروث).

[2]. ئەم فەرموودەیە بوخاری لە باسی (ما ذكر عن بني إسرائيل)دا و (ترمذي) لە باسی (ما جاء في الحديث عن بني إسرائيل)دا هێناویانە، شێخی زەهەبیش (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ئەم بابەتەی جوان لێکداوەتەوە لە کتێبەکەیدا: (الاسرائيليات).

"الحرج" واتە گوناح و بەرتەسکی، مەبەستی پێغەمبەرﷺ ئەوەیە هەرچیەك بڵێن دەربارەی بەنو ئیسرائیل ئەوا ئەوان لەوە خراپتر بوون کە ئێوە دەربارەیان دەیڵێن، بۆیە کەمتان نەوتووە و گوناهباریش نەبوون)، ئیبنو ئەسیر دەیەوێ بڵێ مانای فەرموودەکە – لای ئەو – ئەوەیە هەرچی شتێك دەربارەی بەنو ئیسرائیل بڵێن وایە، هەر چۆنێك باسیان بکەن تیایاندایە، بۆیە هیچ لە سەرتان ناکەوێ، چونکە ئەوان هەر خراپترن لەو وەسفەی ئێوە بۆیان دەکەن، منیش دەڵێم: ئەم مانایە دوورە لە لێکدانەوەوە ئەگەر ئەم برگەیەمان لە تەواوی فەرموودەکەدا وەرگرت، بەڵکو قسەکەی ئیبنو ئەسیر کە دواتر دەیکات زیاتر بە کەڵکمان دێت کە دەڵێ: (ئەمە مانای ئەوە نییە ڕێگا بدات بە هەڵبەستنی درۆ دەربارەی بەنو ئیسرائیل، وە ئەوکەسەشی کە درۆ لەوانەوە بگێڕێتەوە تاوانبار ئەبێت، بەڵکو مانای ئەوەیە کە ڕێگا دراوە هەواڵ و باسەکانیان بگێڕدرێتەوە بۆ زانین و ئاگادار کردنەوەی خەڵکی، ئەگەرچی بە ڕێگای گێڕانەوەی پشتاو پشت و زانینی ئەو کەسانەوە نەبێت کە قسەکانیان گێڕاوەتەوە – واتە سەنەدی گێڕانەوەکان نەزانرابێت – ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ماوەکە زۆر دوور و درێژە و ئەو نەپچڕانە لە گێڕانەوەدا ناکرێ)، منیش دەڵێم: ئەوە بۆ ئەوەیە کە ئەقڵی مسوڵمانان ئامادە بکرێ بۆ وەرگرتنی ئەو هەواڵانە، چونکە فەرموودە و سوننەتەکانی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئەو هەموو ڕاستگۆییەش لە گێڕانەوەکاندا و نزیکیی زەماندا هەر جەخت لەسەر سەنەدەکانیان دەکرێ، بەڵام ئەمە داوا نەکراوە لە هەواڵ و باسی بەنو ئیسرائیل بۆ ئەوەی مسوڵمانان بە نەرمکێشیەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم بابەتەدا بکەن و داوای ئیسناد نەکەن، چونکە ماوەکە زۆر دوورە، دواتر ئیبنو ئەسیر فەرموودەکەی بەو شێوەیەش هێناوە کە ئەبو داوود لە باسی (الحديث عن بني

إسرائيل)دا لـه ئـەبو هـورەيرەوە گێڕاوەتـەوە و هـیچ بەدواداچوونێکیـشی بـۆ نەکردووە کە دەفەرموێ: (حدّثِوا عن بني إسرائيل ولا حرج).

بـەڵام ئیبنـو حەجـەری عەسـقەلانی بـەم شـێوەیە باسـی فەرموودەکـەی کردووە: (حدثوا عن بني إسرائيل ولا حرج) واتە ڕێگا نەگیراوە لێتان کـە باسـی بەنو ئیسائیل بکەن، چونکە پێشتر پێغەمبەرﷺ سەرزەنشتی ئەوانەی دەکـرد کە سەیری کتێبەکانیانی دەکـرد و شـتی لێـوە وەردەگـرتن، بـەڵام دواتـر بـەم فەرموودەیە ئەو ڕێگریە نەما، ئەمەش لە پێشدا بـۆ ئـەوە بـوو تـا حوکمـەکانی ئیسلامو یاساکانی دین دەچەسپێن بۆ ئەوەی فیتنە و ئاشووب دروست نـەبێ، ئەم ڕێگەدانە بە باسـکردنیان ئـەو پەنـد و ئامۆژگاریانـەش دەگرێتـەوە کـە لـە سەردەمی ئەواندا هەبوون، هەروەها وتراوە مانای (لاحـرج) ئەوەیـە کـە دڵتـان توند نەبێ لە بەرامبەر ئەو شتە سەیرانەدا کە بەسەریاندا هاتووە چونکە ئـەوە لە ڕاستیدا هەمووی ڕوویداوە، وە هەندێکی تر دەڵێن (لاحرج) مانای ئەوەی کە ئەگەر باسیشیان نەکەن هیچی تیا بەستە نیە، چونکە لە (فعل)ی یەکەمـدا کـە (حـدثوا)ە مانـای ئـەمری تیایـە ئـەمریش واتـە واجـب بـوون و فـەرزبوونی باسـکردنیان بـەڵام کـە فەرموویـەتی (لاحـرج) ئـەوا مانـای ئەمرەکـەی هەڵوەشاندۆتەوە و مانای ئەوەیە کـە ئەگـەر باسیـشیان نەکـەن قەیـدی نییـە، بـەڵام هەنـدێك پێیـان وایـە کـە (لاحـرج) لابردنـی گونـاح و تاوانـە لەسـەر ئـەو کەسەی کە باسیان دەکات چونکە لە قسەو بەسەرهاتی ئەواندا شتی نابەجێ و نادرووست هەیە وە کەسێکیش ئەو بەسەرهاتانە دەگێڕێتەوە دەبێ وەکو خۆی باسی بکات بەمەش قسە نابەجێکانیان دەڵێتەوە بۆ ئـەو کەسـە هیـچی لەسـەر نییە، قسەکانیشیان وەکو ئەوەی بە موسایان وت (فَاذْهَـبْ أَنـتَ وَرَبُّـكَ فَقَـاتلا) واتە بڕۆن خۆت و خواکەت بجەنگن، یـاخود ئـەوەی وتیـان ﴿اجعـل لنـا إلهـاً﴾

خوایەکمان بۆ داتاشە وەکو ئـەو گەلـەی کـە خواگـەلێکیان هەیـە و دەیبیـنن و لەبەردەستیاندایە، بەڵام من پێموایە کە ئەم قسانە لـە قورئانـدا هـاتوون و لـەو بەسەرهاتانە نـیین کـە خـەڵکی باسـی لێـوەکردوون و نـەدەبوو ئیبنـو حەجـەر ئەمەیانی بهێنایەتەوە، وە وتراوە کـە مەبەسـت لـە بـەنو ئیـسرائیل منداڵـەکانی ئیـسرائیله کـە منداڵـەکانی یـەعقوب پێغەمبـەر (علیـە الـسلام) دەگرێتـەوە مەبەسـتیش ئەوەیـە باسـی ئـەو کوڕانـە و بەسـەرهاتی یوسـف بکـەن هیـچی تیانییە، بەڵام ئەمە زۆر دوورە لەو مانایەوە، ئیمامی مالیك دەفـەرمووێ مانـای ئـەوەی کـە باسـی چـاکەیان بکـەن و ئـەوەی کـە زانیتـان درۆیـە لێـی دوور بکەونەوە، وە ئیمامی شافیعیش دەفەرموێ: دیارە کە پێغەمبەرﷺ ڕێگـا نـادا بە درۆکردن بۆ ئەم فەرموودەیە مانای ئەوەیە باسیان بکـەن بـەو شـتانەی کـە نـازانن درۆیـە و ئەوەشـی پێتـان وایـە درۆیـە باسـی بکـەن قـەیناکا، بـەڵام بـە مەرجێك لەو کاتەدا بڵێن ئەمە بەڕاسـت نـازانین، وەکـو ئـەو فەرموودەیـەی کـە دەفەرموێ: (إذا حدثكم أهل الكتاب فـلا تـصدقوهم ولا تكـذبوهم)[1] لەمـەدا نـە ڕێگادان هاتووە و نەڕێگاگرتنیش، بەڵام من دەڵێم بۆچـی بـچین بـە دوای درۆی گـەلانی درۆزن و قـسەهەڵبەستدا؟ چـیمان لـەوە دەسـت دەکـەوێ؟ لەکاتێکـدا کتێبی خوای گەورەمان لە بەردەسـتدایە و هـەواڵی ئـەوانی تیایـە و بێنیازمـان دەکـا لـەوان و پێویـست بـەو خۆخەریککردنـەی ئیمامـانی گـەورەش ناکـا بـۆ تەئویلکرن و لێکدانەوە.

هەموو ئەمەی کە هەریەك لە ئیبنـو ئەسـیر و ئیبنـو حەجـەر باسـیان لێـوە کردووە، بۆ ئەوەیە کە چارەسەری کێشەی گێڕانەوە و باسکردنی گەلێك بکـەن کە هەم لە قورئـانو هـەم لـە واقیعـدا دەرکـەوتووە درۆزن و قـسەهەڵبەست و

---

[1]. فەرموودەی ژمارە (١٦٧٧٤) لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا.

وەستا بوون لەو بوارەدا، ئەوەتا خوای گەورە بە درۆزن باسیان دەکا: (وَيَقُولُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) (آل عمران: ٧٥) درۆ بەدەم خواوە دەکەن و دەشزانن کە درۆیە، (وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) (المجادلة: ١٤) سوێندی درۆ بە ناوی خواوە دەخۆن و دەشزانن کە درۆیە.

لە ڕاستیدا زانایانی ئەم ئوممەتە شتێك لە دەروونیاندا پەنگی خواردۆتەوە ئەویش ئەوەیە کە ئەم باسکردن و گێڕانەوانەی باسی جوولەکە دەکا، پێیان وابووە ڕێگایەکە بەرەو ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە پێی دەڵێین (باشکردنی پەیوەندی شەرعی و کەلتووریی لەگەڵ جوولەکەدا)، بۆیە ئەم هەموو تەئویلە جۆراوجۆر و دوورانەیان کردووە، بە تایبەت کە فەرموودەکە لە ڕووی سەنەدەوە صەحیحە، سەیرکە ئەگەر زانستی (پێوەرەکانی ڕەخنەگرتن لە مەتنەکان) بە قەدەر زانستەکانی ئیسناد گرنگ بوایە و مەنهەجیەتی مەعریفیی قورئان بەرقەرار بووایە، ئایا زانایان پێویستیان بەم هەموو تەئویلاتە دەبوو؟ بە تایبەت لە کێشە گرنگو گەورەکاندا؟ لەوانەیە زۆر پێویستی بەمە نەکردایە و زۆرێك لە کێشەو مشتومڕی فیکریی دەرگای دزەکردنی فەرهەنگی نەدەبوون، چونکە قورئانی بەرزو بڵند مەنهەجێکی مەعریفیی گشتگیرە و شەریعەتێکی تێر و تەواوە، بەهۆی ئەوەوە دین تەواو کراوە بۆمان، ئەزموونی جوولەکەی سڕیوەتەوە و ئەوەی کە هاوبەش و چاکە لە پەیامی پێغەمبەرانی تر قورئان پاکی کردۆتەوە و بە جوانتر هێناویەتی، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕاستی فەرمووە و قورئانیش شایەتی ڕاستێتی ئەوە، هەریەك لە ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ یارمەتیدەری یەکترن بۆ تێگەیشتن لە دین و لەوەی کە دەبێ ئێمە جیاوازبین لە جوولەکە و نەسرانیەکان، لە چۆنیەتی و خەسڵەت و شێوە و ئاکارماندا، هەروەها ئایەت و فەرموودەکان زۆرترن لەوەی

که بژمێردرێن لەو بارەیەوە، فەرمان بە هەموو مرۆڤایەتی کراوە کە شوێن ئیسلام بکەون و جگە لەویش هیچی تریان لێ قبول ناکرێ (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِيناً فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) (آل عمران: ٨٥)، لەمەوە دەردەکەوێ کە هیچ بەڵگەیەك نامێنێ بۆ گێڕانەوە و باسکردنی کەلەپووری ئەمانە و وتنەوەی درۆکانیان دەربارەی خوای گەورە و پێغەمبەران (عليهم السلام) و پەیامەکانیان، یاخود ڕێگای گێڕانەوەی خۆش بکرێ مەگەر بۆ باسکردنیان بێ وەکو چۆن قورئان باسی لێوە کردوون، ئەویش بۆ خۆپاراستن لێیان و لە کارو کردەوەیان، یاخود بۆ سوودوەرگرتن لە هەواڵە ڕاستەکانیان کە قورئان هێناویەتی و بەڕاستی داناون و دەستنیشانی شوێنی پەندوەرگرتنی کردووە تیایاندا، ئیتر نازانم چ هۆکارێك هەبووە کە لەو سەردەمە سەرەتایەی ئیسلامدا ئاوا بە ڕووی ئەو کەلەپوورەدا کراونەتەوە و شتیان لێوەرگرتووە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جەختی کردووە لەسەر نەخوێندنەوەی سیفرو نووسراوەکانیان لە لایەن خەڵکانی خاوەن زانست و فیقه و لێزانی وەکو عومەری کوڕی خەتتابەوە رضي الله عنه، ئەی دەبێ بۆ خەڵکیتر چی بێ؟ ئەوەتا جابیر لە عەبدوڵڵاوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تسألوا أهل الكتاب عن شيء فإنهم لن يهدوكم وقد ضلّوا، فإنكم إمّا أن تصدّقوا بالباطل أو تكذبوا بالحق، فإنه لو كان موسى حياً بين أظهركم ما حلّ له إلا أن يتبعني)[١].

مەنناوی لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێ: "ئەگەر موسا لە ئاسمانی دونیاوە دابەزێ و شوێنی بکەون، ئەوا سەرتان لێشێواوە"، واتە لە ڕاستەڕێ لاتان داوە، چونکە شەرعەکەم شەریعەتی ئەوی سڕیوەتەوە". ڕاغبیش دەڵێ:

---

[1]. ئەم فەرموودەیە لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا ژمارەی (٣٣٨/٣)ە.

"سەرلێشێواویی لادانە لە بەردەوامی و ڕاستەڕێ و دژی هیدایەتە (من بەشی ئێوەم لە پێغەمبەران و ئێوەش بەشی منن لە ئوممەتان)، خوای گەورە ئێوەی ڕاسپاردووە دوای من بکەون و منیشی ڕاسپاردووە کە ئێوە بۆ لای ئەو بانگ بکەم". حەڕڕانی دەڵێ: "ئەگەر ئەمە بۆ موسا بێ ئەوا بۆ شوێنەکەوتوانیشی پێویستە کە خۆیان بە شوێنکەوتووی بزانن، مادام پێغەمبەرﷺ سەرەتایە بۆ کۆتایی و هەتاهەتایی، دەبێ بە هەمانشێوە کۆتاییش بێت بۆ گەڕانەوە بۆلای خوا، ئەمەش خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر ئەوانەی حەز دەکەن شوێنی بکەون، ئەمەشی لە زمانی پێغەمبەرەوەﷺ ڕاگەیاندووە کە ئەو پێغەمبەری مژدەدەرە، کەسێك شوێنی نەکەوێ ئەم ڕاستیەی شاردۆتەوە".

هەندێکی تریش وتوویانە: ئەمە لە کاتێکدا کە گریمان موساش دابەزی، مانای ئەوە نییە کەپێغەمبەرﷺ لە پێغەمبەرایەتی دەکەوێ و لە پەیامەکەی لادەدا، بەڵکو ئەگەر گریمان موساش دابەزێ ئەوا بە پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ ڕازی دەبێ و لەسەر پەیام و بەرنامەی ئەو دەڕوا، هەروەکو چۆن لە سەردەمی ئیبراهیمدا شەریعەت بۆ ئەو بوو لە کاتێکدا (لوط)یش هەبوو، لە سەردەمی عیسادا شەریعەتی (عیسا) بوو نەك (یەحیا)، واتە ئەگەر موساش لە زەمانی منـدا بووایـە، ئـەوا دەبوایـە شـوێنی مـن بکـەون، ئەگـەرنا سـەرگەردان و سەرلێشێواو دەبوون.

پاشان ئەگەر هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ و حافز قورئانەکانیان هەتا کۆتایی سەردەمی هەردوو شێخ واتە ئەبوبەکر و عومەر زۆر خۆیان دەپاراست لە گێڕانەوە و ڕیوایەتکردنی فەرموودەکان بۆ ئەوەی کە خەڵکی لە قورئان دوور نەکەونەوە، تەنانەت بۆلای فەرموودەی پێغەمبەریشﷺ، بەتایبەت کە فەرموودە شیکەرەوە و بەیانکەری ئایینی پیرۆزی ئیسلامە و ڕوونکەرەوەی

ماناكانیەتی بە زمانی شیرینی خۆیﷺ، کەواتە چۆن دەبێ کارئاسانییان کردبێ بۆ گێڕانەوەی بەنو ئیسرائیل بەبێ سەنەد و دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستیی هەواڵەکان، یاخود کەوتبنە باسکردنو کرانەوە بە سەر کەلەپووری جوولەکەدا بەبێ لە بێژینگدان و شوێنکەوتنی مەنهەجێکی قورئانی، کەواتە ئەو فەرموودەیەی کە وتمان (حدثوا عن بني إسرائيل ولا حرج) دەبێ چیرۆکێك و ڕووداوێکی هەبێ، یاخود هۆکارێك هەبووبێ بۆ وتنی کە بێگومان نەگێڕدراوەتەوە و لەگەڵیدا باس نەکراوە، بۆیە وا دەزانرێ کە ئەم فەرموودەیە ڕەهایە و بۆ هەموو قسەکردن و گێڕانەوەیەك دەگونجێ دەربارەی بەنو ئیسرائیل.

## دزەکردنی مەعریفی

دەبینن کە چۆن ئەم فەرموودەیە هۆکاری سەرەکیی دەرگاکردنەوە بوو لە دواتردا لەسەر ترسناکترین کردەی دزەکردنی مەعریفی کە مرۆڤایەتی بەخۆیەوە بینیویەتی و تا ئێستاش پێیەوە دەناڵێنێ؟ ئایا تەنها ئەم فەرموودەیە تاکە ئامرازبووە بۆ شکاندنی ئەو دیوارە دەروونییەی کە لە نێوان مسوڵمانان و گێڕانەوە ئیسرائیلییەکاندا بووە؟ بۆ ئەوەی دواتر کتێبەکانی تەفسیر و مێژوو پڕببن لە ئیسرائیلیات؟ تەنانەت خزاوەتە ناو هەندێك بابەتی فیقه و ئوسوڵی ئیسلامییشەوە؟ دواتر قۆناغی بێئاگابوون لە خەسڵەتەکانی شەریعەتی ئیسلامیی دەست پێبکات؟

بەڵێ ئەم فەرموودەیە لەوانەیە لەوە زیاتریشی بخەینە سەر شان، بە هۆی ئەمەشەوە بیرۆکەی پیلانگێڕیی بەهێز دەبێ، وە دەشکرێ جوولەکە لەوەش زیرەکتر بووبن کە دەبوایە ببن، لەوانەیە وای بۆ بچین کە مسوڵمانانی پێشین

لەم سەردەمانەی دواییدا لە بەرامبەر دوژمن و ململانێکارەکانیاندا دەسەوسان وەستابن، یاخود هەڵوێستی سلبییان هەبووبێ لە بەرامبەریدا، هەروەها گوێیان بە هیچ نەدابێ ، بەشێوەیەك کە دوژمنەکانیان هەرچیەکیان ویستبێ و چۆنیان ویستبێ لە کوێوە کردبێتیان، بەڵام ئەمە کێشەیەکە دەبێ بە پێی خۆی لێکی بدەینەوە بەبێ زیادەڕۆیی و دەبێ تۆزێك بگەڕێینەوە بۆ پێش پێغەمبەرایەتی و ژیان و گوزەرانی عەرەب لە وڵاتی خۆیاندا لە سەرەتاکانی پێغەمبەرێتیدا، تا شتەکەمان بۆ ڕوون ببێتەوە.

(محمد عزت دروزة) ڕەحمەتی خوای لێبێ چەند ڕیوایەتێکی کورت کردۆتەوە لە چەندین سەرچاوەی کۆنی عەرەبیەوە، کە سەرچاوەی ئەوانی تریش پشتڕاستی دەکەنەوە، بەم شێوەیە: کۆمەڵێکی زۆر لە بەنو ئیسرائیل هاتوونەتە ناوچە جیاوازەکانی حیجاز لە سەردەمێکی کۆنەوە و زۆربەیان لە (یەسریب) نیشتەجێ بوون، لەولایەوە کە دەکەوێتە سەر ڕێگای شام، هەروەها هەندێکیان هاتوچۆی (مەککە)یان دەکرد و لەوێش نیشتەجێ دەبوون، فێری زمانی عەرەبی بوون و لە عادەت و داب و نەریتیان شارەزا بوون، لە ناو عەرەبدا دۆست و هاوپەیمان و خۆشەویستیان بۆ دروست بوون، ئەمانیش لەلای خۆیانەوە زانستێکی زۆریان دەربارەی ئایینەکان و هەواڵی میللەتانی ڕابردوو یاساکانی بوونەوەر و ئەو ئایینە ئاسمانیەی کە هەیانبوو بڵاو کردەوە، ئەو کتێبەشی کە دەیانوت هی خوایە و بۆیان دابەزیوە، بڵاویانکردەوە، بەمەش شانازیان بە ئایین و خۆیانەوە دەکرد بەرامبەر عەرەب کە ئەوان هیچ نازانن ئەمانیش ئایینیان هەیە، زانست و زانیاریەکی زۆریش دەزانن، وە دەشیانوت گوایە ئەوان هاوەڵ و خۆشەویستی خوان، ئەمەش کاری کردە عەرەب و جوولەکەکانیش پلە و پایەیەکی گەورەیان دەست کەوت، بە هۆیەوە

دەبوون بە قازی و ڕێگاپیشاندەری خەڵك، هەروەها بوون و کیانێکی ئاییینیان بۆ خۆیان دروست کردبوو پەرستگا و قوتابخانە و خواپەرست و عابیدیان هەبوو، ئەمانە بوون بە خاوەن کاریگەری و هەیانبوو ئەم هێزەی دەقۆستەوە بۆ پارەپەیداکردن، هەندێکیان بە سیحر و جادووگەرییەوە خەریك بوون و کۆمەڵە ڕەوەندێکی زۆر بوون لە ڕووی ژمارەوە، زۆریان گەڕەك و ناوچەی تایبەت بە خۆیان دروست کردبوو، لە مەدینەدا، بە دەوریدا قەڵا و شوورە و دیواریان دروست کردبوو، هەندێکیان لە ناوچە دوورەکانی دەرەوەی مەدینەدا نیشتەجێ بووبوون، قەڵا و شوورەیان لەوێ بنیاتنابوو، خەریکی دروستکردنی جۆرەها چەك بوون کە لەو سەردەمەدا بەکار دەهات، وەکو شمشێر و ڕم و تیروکەوان و درع و قەڵغان، بەڵام ئەمانە لە قەوارەیەکی ئایینی سیاسیی عەسکریی یەکگرتوودا کۆنەبووبوونەوە، بەڵکو پەرتەوازە بوون و هەر کۆمەڵە سەربەخۆی بوو، لەناو عەرەبیشدا لە مەدینە ئەوکاتە دوو هۆزی گەورە هەبوون کە ئەوس و خەزرەج بوون، لە نێوانیاندا شەڕ و ئاشووب هەبوو، جوولەکەکانیش بەم پێیە هەندێکیان هاوپەیمان و هاوسۆز بوون لەگەڵ ئەوس و هەندێکی تریشیان لەگەڵ خەزرەجدا، بەرامبەری یەکتری دەجەنگان، ئەم هاوپەیمانیەتیەشیان تەنها لە پێناوی مانەوەیاندا بوو، بۆیە حەزیشیان دەکرد ئەو دووبەرەکیە لە نێوان عەرەبدا بمێنێتەوە، چونکە مانەوەی ئەوانی مسۆگەر دەکرد، هەروەها جوولەکەکان خاوەنی کێڵگە و باخ و بێستان بوون، زۆریان بە بازرگانییەوە خەریك بوون و سووخواردن لایان زۆر باوبوو، هەندێکیان بەم شێوەیە پارەیەکی زۆریان دەست کەوت بەمەش بوون بە خاوەن قسە لە ناو عەرەبدا.

نەك هەر ئـەوە بـەڵكو تێكـەڵاوبوونیان بـە ژینگـەی عـەرەبی وایكردبـوو كـە هەندێكیان ژن و ژنخوازی لەگەڵ هۆزە عەرەبەكاندا بكەن، تێكـەڵیی خـوێن لـە نێوانیاندا دروسـت ببـێ بـە شـێوەیەك كـە جیاكردنـەوەیان ئاسـان نـەبێ، كـێ دەیتوانی كە جوولەكە و عەرەب جیا بكاتەوە پێش هاتنی پێغەمبەرﷺ لە نـاو هۆزەكانی وكو (بني عكرمه وبني ثعلبة وبني جشم وبني عوف وبـني القـصيص وبني الحجاز وبني الحارث وبني ساعدة وبني الأوس وبني الشطبية وبني بهدلـة و بني كعب وبني محمر وبني وائل) و ئەم هۆزە جوولەكانە سـاڵانێكی زۆر لـە نـاو دوورگەی عەرەبییدا مانەوە، دواتر بوون بە خانەی شێرپـەنجە لـەناو جەسـتـەی كۆمـەڵگای ئیـسلامیی لـە سـەردەمی یەكەمیـدا، زمانیـان عـەرەبی بـوو جیـا نەدەكرانـەوە، وە هـەر ئـەو زمانـە عەرەبیـەی كـە ئـەوانیش لەگـەڵ عەرەبـدا قـسەیان پێـدەكرد، بـوو بـە سەرچـاوەی تەفـسیركردنی قورئـان، چـۆن جیـا بكرێنەوە لە كاتێكدا ناوی منداڵەكانیان بریتیبوو لە (عبدالله ومعـاذ وليـث وسـعد ووائل وسفيان ومالك ومنذر ونعمان وميمون ووليد) و زۆرێـك لـە نـاویتر كەلـەناو عەرەبدا بڵاوبوون، ئەمەش سەیر نییە چونكە ئەوان بەشـێك بـوون لـە عـەرەبی مەدینە بە تایبەتی و ناوچەی حیجاز بە گشتی، بەم شێوەیەش ڕۆشـنبیرییەكی فراوانی جوولەكەیان لە ناوچەكەدا بڵاو كردبووەوە و بووبوون بە سەرچـاوەیەك بـە تایبـەتی بـۆ عەرەبـە نەخوێنـدەوارەكانی ناوچـەكە، ئـیبن خەلـدون دەڵـێ: "عـەرەب خـاوەنی كتێـب و زانـست نـەبوون، بـەڵكو سروشـتی دەشـتەكێتی و نەخوێندەواریی زاڵ بـوو بـە سـەریاندا، ئەگـەر شتێكیـشیان زانیبـێ دەربـارەی بوونـەوەر و سـەرەتای دروسـتبوون و نهێنیـەكانی بـوون، ئـەوا پرسـیاریان لـە ئەهلی كیتاب كردووە و لەوانەوە فێربوون، ئەوانیش خاوەنی تـەورات بـوون لـە جوولەكە و ئەوانەی شوێنیان كەوتبوون، ئەو عەرەبانەی كە جوولەكـە بـوون و

له ناو دوورگەی عەرەبدا ژیاون ئەوا نەزان بوون و شتێکی زیاتریان نەزانییوە له خاوەن کتێبەکان، زۆربەی ئەوانە لە (حمیر) بوون، کە مسوڵمانیش بوون ئەوە کە دەیانزانی لە تەورات هەر مایەوە لە لایان، مەبەست لەو شتانەیە کە پەیوەندی بە ئەحکامی شەرعییەوە نییە، بەڵکو تایبەتن بە مەسەلەکانی سەرەتای دروستبوون و دەربارەی شەوو ڕۆژ و چیرۆکە پاڵەوانییەکان، نموونەی ئەمانەش وەکو (عبدالله الأحبار و وهب بن منبه و عبدالله بن سلام) و تەفسیرەکان پڕبوون لە گێڕانەوەی ئەمانە، زانایانی تەفسیریش لەگەڵ ئەمانەدا ئاسانگیر بوون، ئەمانەش وەکو وتمان ئەهلی تەورات بوون، هەرچەند زانیاریان نەبوو دەربارەی ڕاستی و درووستیی ئەوەی کە دەیڵێن، بەڵام ناوبانگیان دەرکردبوو بە کەسانی دیندار و خاوەن پایە دەهاتنە ئەژمار لەو ڕۆژەدا"[1].

دوای ئەوەش سەیر نییە کە عەرەبەکان بۆ پرسیارکردن دەربارەی ئیسلام گەڕابنەوە بۆلای ئەمان، (تەبەری) دەگێڕێتەوە کە گوایە کۆمەڵێك لە جوولەکە هاتن بۆلای قوڕەیش لە مەککە و بانگیان کردن بۆ شەڕ دژی پێغەمبەری خواﷺ، ئەوانیش وتیان ئێمە لەگەڵتانین تا لە ڕەگ و ڕیشە دەریدەهێنین، قوڕەیشیش لێیان پرسین: ئێوە ئەی جوولەکەکان خاوەنی یەکەم کتێبی ئاسمانین و زانیاریتان هەیە دەربارەی ئەوەی کە ئێمە و موحەممەد لەسەری ناکۆکین، ئایا ئاینی ئێمە ڕاستە یاخود ئاینی موحەممەد؟ ئەوانیش وتیان: ئاینی ئێوە و باوك و باپیرتان چاکتر و ڕاستترە. دەربارەی ئەم ڕووداوەش ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيباً مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَؤُلاء أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ سَبِيلاً* أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللّهُ وَمَن يَلْعَنِ اللّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ نَصِيراً) (النساء: ٥١ – ٥٢).

---

1. بۆ ئەمە سەیری (مقدمة)ی ئیبن خەلدون بکە.

دیاره بڵاوبوونەوە و بوونیان تەنیا لە ناوچەکانی مەککە و مەدینەدا نەبوو، بەڵکو ئەم خانە سەرەتانیانە یەمەنیشیان گرتبووەوە، لە گێڕانەوە عەرەبییەکاندا هاتووە و نووسراوە، کە یۆنانی و ڕۆمانیەکانیش دووپاتی دەکەنەوە گوایە یەکێك لە پاشاکانی حیمیەر لە یەمەن کە ناوی ئەسعەد کوڕی کەریب دەبێت، جارێك بە لای یەکێك لە گەڕەکەکانی یەسریبدا تێدەپەڕێ، دوو زانای ئایینیی جوولەکە دێن بۆلای و ئەویش زۆر پێیان سەرسام دەبێ و شوێن دینەکەیان دەکەوێ، بانگیان دەکا بۆ یەمەن و بە گەلەکەی دەڵێ شوێن ئەمانە بکەون کە من شوێنیان کەوتووم و ئەوانیش بە قسەی دەکەن، بەم شێوەیە جوولەکایەتی لە یەمەندا پەرە دەستێنێ، ئەم ڕووداوە وا دەردەکەوێ کە لە سەدەی پێنجی دوای زاییندا ڕوویدابێ، هەروەها مژدەدەرە نەسرانیەکانیش لە سەدەی چوارەمی زایینەوە چووبوون بۆ یەمەن لە ڕێگای حەبەشەوە، دوای ئەوەی کە نەسرانیەت لەسەر دەستی ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورەی ڕۆمانی هاندرا و یارمەتی درا لەو ناوچانەدا، بەم شێوەیە هەردوو ئایینی مەسیحی و جوولەکە لە یەمەندا پەرەیان سەند، بە تایبەتی دوای ئەوە کە جوولەکایەتی بوو بە ئایینی رەسمیی پاشاکانی حیمیەر لایەنگرانی هەردوولا کەوتنە پیلانگێڕان دژی یەکتری لە دەرەنجامی ئەو ناکۆکیەی کە لە نێوان هەردوو ئاییندا هەبوو لە میسر و شامدا، لە یەکەم قۆناغدا جوولەکەکان بردیانەوە لە نەسرانیەکان، لە سەرەتای سەدەی شەشەمی زاییندا، لە سەردەمی پاشای حیمیەری (ذو نواس)دا، لە کاتێکدا جوولەکەکان لە سەردەستی هیرەقل پاشای ڕۆمەکان لە شامدا دەچەوسانەوە، ئەمانیش لە یەمەن کەوتنە قەلاچۆکردنی نەسرانیەکان هەتا دەڵێ وایان لەو پاشایە کرد کە خەندەکێکی درێژ هەڵکەنێ و ئاگرێکی بلێسەداری تیا بکاتەوە و ئەوانەی کە لەسەر ئایینی

نەسڕانی مانەوە لە یەمەن و نەبوون بە جوولەکـە، هـەموویانی بخاتـە نـاوەوە، ئەم چیرۆکە لەو نامەیەشدا ئاماژەی پێدراوە کە (مار شمعون) ئوسقوفی (بیـت أرشام) (اسمـی علمـە) ناردوویـەتی بـۆ سـەرۆکی ناوچـەی دیجلـە، یوحـەنناش دەقـی نامەکـەی بڵاوکردۆتـەوە لـە مێـژووی کەنیـسەییدا کـە نووسـیوویەتی و وەسفی ئەو ڕووداوەی کردووە بە پشتبەستن بە قسەی ئـەو شـایەتحاڵانەی کـە ڕووداوەکەیان بینیـوە لـە یەمـەن لـە سـاڵی (٥٢٤)دا، دەڵـێ: پاشـای حیمیـەر نوێنەرێکی ناردووە بۆ لای پاشای حیرە کە ئەم چی بە سەر جوولەکەکانی لای خۆی هێناوە ئەویش هەمان کار بکات لەگەڵیاندا.

بەڵام ئەم چەوساندنەوەیە لە یەمەن کۆتایی هات بـە داگیرکردنـی لـە لایـەن حەبەشـــیەکانەوە لـــە ســـێیەکی یەکـــەمی ســـەدەی شەشـــەمدا، توانیـــان هاوئاینـەکانیان ڕزگـار بکـەن لێـی و میرنـشینی حیمیـەریان ڕووخانـد و خۆیـان حوکمی ناوچەکەیان گرتە دەست بە پاڵپشتیی ڕۆم، هـەروەها توانیـان مـاوەی حەفتا سـاڵ حـوکمی ئـەو ناوچـەیە بکـەن، دیـارە لـەم کاتەشـدا نەسڕانیەکان هەمان کاریان کرد دەرهەق بە جوولەکەکان کە پێیان کرابـوو، تـا وایـان لێهـات خەریك بوو بەتەواوی تیابچن.

بەڵام ئەوانەی لە دەوروبەری یەسریبدا مابوونەوە لەسـەر ڕێگـای شـام ئـەوا مانەوە تـا هـاتنی پێغەمبـەرﷺ و کۆچـکردنی بـۆ مەدینـە، کـە لـەوێ کەوتنـە بەربـــەرەکانیی مـــسوڵمانان و پیلانگێـــڕان دژیـــان، لەمبارەیـــەوە ئایـــەت و فەرموودەی زۆر هەن دەربارەی حاڵ و بوون و ڕەوشت و کردەوەیـان، تـا کـار گەیـشتە ئـەوەی پێکـدادان و جـەنگی لێبکەوێتـەوە و هەنـدێکیان دەرچـوون و هەندێکیشیان تیاچوون و ناوچەکەیان لـێ پاککرایـەوە دوای حـەوت سـەدە لـە ژیانی هاوبەش و تێکەڵبوونیان لەگەڵ عەرەبدا.

## ئامادەیی فیکریی جوولەکە

ئەمەی باسمان کرد لە ڕووە ماددییەکەیەوە بوو، بەڵام ئامادەییان لە ڕووی فیکری و ڕۆشنبیرییەوە ئەوا چیرۆکێکی تەواو جیایە، خوای گەورە موسای هەڵبژارد وەکو پێغەمبەر و نێرراوی خۆی بۆ لای بەنو ئیسرائیل تەنها و بەس، خوای گەورە خۆی چاودێری گەورەبوونی موسای (علیه السلام) دەکرد لە ڕووی دەروونی و ئەقڵیەوە (وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي) (طه: ٣٩) بۆ ئەوەی تایبەتمەندیی کەسێکی تیا دروست ببێ کە پێشەوایەتی گەلی ئیسرائیل بکات و ڕزگایان بکات لە هەمان کاتدا پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خواش بێت، ئەو گەلە ڕزگار بکات کە چەوساوە و ژێردەستی ستەمی سیستمێکی زۆردار بوون (إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعاً يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ* وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ* وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِي فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ) (القصص: ٤ – ٦)، بێگومان سروشتی موسا و کەسایەتی ئەو لە پێشەوایەکی دامەزراو و بەهێز دەچوو کە گەلەکەی پشتی بگرن و ئەویش هەموو ڕەهەندەکانی ناڕەحەتی و ناهەمواریی ئەوانی دەزانی هەر وەکو کەسێکی نەتەوەخواز هیچ بەلایەوە نەنگی نەبوو کە بە هەر شێوەیەك بتوانێ بەرگری لەو گەلەی بکات، لەهەمان کاتیشدا ئەو نێردراو بوو بۆ لای ئەو گەلە لە لایەن خواوە، هەر لە لایەن خواوە حوکم و زانست و بیروباوەڕ و شەریعەتی بۆ هاتبوو کە نەیدەتوانی لێی لابدا، بەڵام بەنو ئیسرائیل لەم هەڵبژاردنە خواییە تێنەدەگەیشتن وەکو خۆی کە لە ئادەمەوە خوای گەورە کاری ئاوەدانکردنەوە و جێنشینایەتی خۆی بە مرۆڤ بەخشیوە، بەڵکو ئەوان وا تێگەیشتبوون کە

خوای گەورە جوولەکەی کردووە بە ناوەنـدی گـەلانی جیهـان و دەبـێ بـبن بـە پێشەنگی هەموو گەلان، چونکە هەر ئەوان سەربازی خوانو گـەلی هەڵبـژاردەی ئەون، وەکو ئەوەی خـوا تـەنها خـوای ئیـسرائیلییەکان بێـت نـەك هـی هـەموو بوونـەوەر، چـونکە دەیـانوت (یهـوە) واتـە (خـوای سـەربازەکان) کـە وازی لـە هەموو دروستکراوەکانی هێناوە بۆ ئەوەی خۆی تەرخان بکـات بـۆ جوولەکـە و سەروەریی مێژوو و خەونەکانی ئەوان.

## ڕۆڵی حیکایەتخوانو وتاربێژەکان لەتێکەڵکردنی شتەکاندا

بەڕاسـتی ئـەو ڕۆڵـەی کـە حیکایـەتخوان و وتاربێـژەکان لـە مزگەوتەکانـدا بینیویانـە ترسـناکە، ئـەوان پـەرەیان بـە کەلـەپووری ئیـسرائیلییەکان داوەو پـشتیان پێبەسـتووە و مەجلیـسیان پـێ گـەرم کـردووەو وتارەکانیـان پـێ ڕازاندۆتـەوە، هـەر لەمەشـەوە گوێزراوەتـەوە بـۆ نـاو تەفـسیر، ئەمانـە لـە مزگەوتەکانـدا دادەنیـشتن و قـسەیان بـۆ خـەڵکی دەکـرد، ئـەو خەڵکـەش کـە گوێیـان لێـدەگرت، خـەڵکی سـادەبوون کـە بـۆ بیـستنی چـیرۆك و شـتی سەرسـوڕهێنەر و کـات بەسـەربردن دەهـاتن، ئـەوانیش ئیـسرائیلیاتیان بـۆ دەگێڕانـەوە، دیاریـشە کـە فـەرموودە لـە سـاڵی (٨٣ك)دا دەسـتکرا بـە کۆکردنـەوەی لەسـەر دەسـتی خەلیفـە عەبدولعـەزیزی بـاوکی عومـەری کـوڕی عەبدولعەزیز، لە سەردەمی عومەری کوڕیشیدا بە تـەواوی تـەواو کـرا لـە سـاڵی (٩٩ك)دا، تەفسیریش ئەوکاتە دەرگایەك بوو لە دەرگاکانی فـەرموودە، چـونکە ئـەویش گرنگـی دەدا بـە کۆکردنـەوەی گێڕدراوەکـان و ئـەو شـتانەی کـە لـە پێغەمبـەرەوە بـەجێماون، بـەڵام کاتێـك زانـستی تەفـسیر و فـەرموودە لێـك جیابوونەوە، ئەوانەی کە تەفسیریشیان دەنووسی فـەرموودەیان کـۆدەکردەوە

و ئیسنادەکانیشیان دەنووسی، بەڵام وەکو فەرموودەناسان گرنگیان نەدەدا بە زانستی (الجرح والتعدیل) کە زانستی فەرموودەناسیە و سەنەدی فەرموودەکان جیا دەکاتەوە و پلەی ڕاویەکان دیاری دەکات، چونکە ئەوان وایان دەزانی تەنها باسکردنی سەنەدەکان بەسە بۆ ڕاستیی فەرموودەکان، کاتێکیش کورتبڕی لە نووسیندا پەیڕەوکرا، ئیتر ئەم سەنەدانەش نەدەنووسران، بۆیە زۆربەی خەڵکی گوێی نەدەدا بە بەدواداچوونی فەرموودەکان لە ڕووی سەنەدەوە، ئیبنو خەلدون لەو دەقەی پێشوودا کە باسمان کرد باسی ئەم دیاردە ترسناکەی کردووە، لە (مقدمة)کەیدا، کە زیاتر وای لێکردین باسی کاریگەریی جوولەکە بکەین لەسەر کەلەپووری ئیسلامیی، کە بەڕاستی کاریگەریی زۆریان بەجێ هێشتووە لەسەری، بە شێوەیەك وای کردووە زۆرێك لە خەسڵەتە جوانەکانی شەریعەتمان ون ببێ تا لە هەندێ شوێندا شەریعەتی شێوێنراوی ئەوان لەهی ئێمە ئاسان و باشتر دەرکەوێ، هەر ئەم مەسەلەی ئاسانی و قوورسیە لە شەریعەتدا بابەتی سەرەکیمان بوو کە لەمێژە ونمان کردووە و بەدوایدا وێڵین لە ناو فیقهدا، لەوانەش مەسەلەی (هەڵگەڕانەوە) کە بابەتی باسەکەمانە، شتی تریش کە پەیوەندیدارن بە هەندێ سزاوە کە تیایدا زۆرترین زەرفی موشەدەد تێبینی کراوە و ئەوپەڕی سنوور و لایەنی تەمێکردنی تیایە، هەروەکو کەلتوورێکی داخ لەدڵیشیان فەرامۆش کردووە، کە هەمیشە چاوی لەسەرمانە کاتێك پەیوەندیمان بە خواو کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەوەﷺ لاواز دەبێ و لە مێژوو و کەلەپووری خۆمان دەیپچڕێنین.

## بانگەشەی کۆکبوون لەسەر واجببوونی کوشتنی هەڵگەڕاوە

زۆربەی زانایـان دەرگـای قـسەکردن لەسـەر ئـەم بابەتـەیان داخـستووە بـە شمـشێری کۆکبـوون (إجمـاع)، هـەروەها بانگەشـەی ئیجمـاع لـە سـەردەمێکی زووەوە کراوە بـە ئامرازێـك و بەربەسـتێك بـۆ پیاداچـوونەوەی هەنـدێ بابـەتی ترسـناك – وەکـو ئـەم بابەتـە – لەگـەڵ بـوونی نـاکۆکیی لەسـەر حـوکمی هەڵگەڕاوە لە هەرسێ چاخی زێڕیندا و بەدینەهاتنی ئیجماع لـەو کاتـەدا، بـەڵام بانگەشـەکارانی کـۆکیی لەسـەر کوشـتنی کەسـی هەڵگـەڕاوە سـوورن لەسـەر ئەوەی کە ئیجمـاع هەیـە، ئەمـەش بۆتـە بەربەسـت لـە بـەردەم لاکردنـەوە لـە ناکۆکیی عومەری کوڕی خەتتاب و ئیبراهیمـی نەخـەعی و سـوفیانی سـەوریدا، خەڵکانی تریش جگە لەوان، ئەمانە تەنانـەت وایـانکردووە کـە دەرگـا دابخرێـت لەسەر هەر پیاچوونەوەیەك یان هەر هەوڵێکی لەو جۆرە لەم سـەردەمەدا، کـێ دەتوانێ بە حوکمێکدا بچێتەوە کە کۆکیی زانایانی لەسەر بێ؟

## هەڵگەڕانەوە لە نێوان حیزبی بەعسی عیراقی و حیزبی شیوعیدا

لێکۆڵینەوەی زۆر نووسراوە لەسەر (هەڵگەڕانەوە و حوکمەکەی) هەندێکیان بۆ بەدەستهێنانی پلەی زانستیی باڵا بوون (ماجستێر و دوکتۆرا) و هەنـدێکیان ئامادە کرابوون لە چوارچێوەی لێکۆڵینـەوەی سـنوورە شـەرعییەکاندا[1]، ئـەم لێکۆڵینەوانە زۆر سەرپێییانە بەسەر بۆچوونی ئەوانەدا ڕابـوردوون کـە نـاکۆکن

1. لەو لێکۆڵینەوانەی کـە مـن بینیـومن: کتێبـی (د. نعمـان الـسامرائي) کـە نامەیـەکی ماسـتەر بـوو لەسـەر هەڵگەڕانەوە.

دەربارەی حوکمی هەڵگەڕانەوە لە هاوەڵان و غەیری ئەوانیش، ئەگەرچی هەندێکیان زۆر خاوەن ڕێزن لەو ناڕازیانە، لە پێش هەمووشیانەوە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، ئەم بابەتە زۆر سەرنجی ڕاکێشام بە تایبەتی دوای ئەوەی تاقیکرامەوە بە فتوادان لەسەر مەسەلەی (هەڵگەڕانەوە)، ئەمەش ترسناکترین شت بوو بە سەرمدا تێپەڕی لە ژیانمدا، کاریگەریەکی زۆریشی هەبوو لەسەر ئەقڵیەت و دەروونم، بەڵکو لەسەر هەموو ژیانم، بە داخەوە کە ئەم بابەتەم بۆ پێشنیار کرا لە سەرەتای ژیانی زانستیمدا بووم، دوای بەدەستهێنانی یەکەم بڕوانامەی بالاّم لە ئەزهەری شەریف لە ساڵی ١٩٥٩، دوای دەرچوونم گەڕامەوە بۆ عێراق و کۆدەتا سەربازییەکەی "حیزبی بەعس" لە لایەن باڵی میشیل عەفلەقەوە دژی عەبدولکەریم قاسم لە (٨ی شوباتی – ١٩٦٣)دا ڕوویدا ، لە تەمموزی هەمان ساڵیشدا شیوعییەکان هەستان بە هەوڵێکی کۆدەتا دژی حکومەتی "عەبدولسەلام عارف، حیزبی بەعسی باڵی میشیل عەفلەق"، بەلاّم هەوڵەکە شکستی هێنا، لە ئەنجامدا هەرکەسێکی شیوعی کە حکومەت دەستی پێی گەیشت دەستگیری کرد، هەفتەیەك زیاتری نەبرد ژمارەی گیراوەکان لە پێنج هەزار و پێنجسەد تێپەڕی، لە سەرەتادا هەموویانیان لە دوو بەندیخانەی گەورە لە سەربازگەی ڕەشید کۆکردەوە، بەندیخانەی ژمارە یەك و بەندیخانەی دەبابات، دوای ئەوە بە شەمەندەفەری کەلوپەل گوێزرانەوە بۆ بەندیخانە نووگرە سەلمان لە هاوینێکی گەرم و سووتێنەر دا، لەو بیابانە وشك و برینگەی دەکەوێتە نێوان سنووری سعودیە و عێراق کە بە ناوچەی بێلایەن دەناسرێ، لەو شەمەندەفەرەدا کە شیوعیەکان ناوی شەمەندەفەری مەرگیان لێنابوو، چەندین کەس مرد لێیان، لەوکاتەدا ژمارەی شیوعیەکانی عێراق لە هەشت هەزار کەس زیاتر نەبوو، دوای ئەوە ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی

بەعسی کۆبووەوەو بڕیاریدا کە حیزبی شیوعی هەمووی لە سێدارە بدرێ، سەرەتا ئەوانەی کە دەستگیر کراون — واتە پێنج هەزارەکە — و دواتر ئەوەی دەستیان پێی گەیشت و ڕۆژی لە سێدارەدان و لایەنی پەیوەندیداریان دیاری کرد، جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەش بە لیوا ڕوکن (عبدالغني محمد سعيد الراوي) سپێردرا کە ئەوکاتە لێپرسراوی فیرقەی مودەرەعەی سێ بوو ، فەرمان کرابوو بە بەڕێز ڕاوی کە (فەصیلەی ئاگر) بەرێت لەو سەربازانەی لە ژێر دەستیدا بوون و بە فڕۆکە بچێت بۆ نووگرە سەلمان بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش، بڕێك پارەشی پێدرابوو بۆ ئەوەی دابەشی بکات بە سەر سەربازەکانیدا کە ئەو کارە جێبەجێ دەکەن بۆ هاندانیان، هەموو شتێك ئامادەکرابوو، بەڕێز ڕاوی پیاوێکی نوێژخوێن بوو کاتێك ئەو ژمارە زۆرەی بینی کە دەبێ بیانکوژێ و لە پێنج هەزار کەس زیاترن، هەستی بە ترسناکیی مەسەلەکە کرد و داوای فتوای گەورەزانایانی کرد لە وڵاتدا لە سوننە و شیعە، حکومەتیش ڕای سپارد کە بچێتە لای سەیید (محسن الحكيم) کە ئەوکاتە گەورە مەرجەعی شیعەکان بوو، هەروەها ئیمامی مزگەوتی خالصی لە کازمیە کە ئەویش یەکێك لە مەرجەعەکان بوو، هەروەها موفتی سوننی عیراق (نجم الدين الواعظ)، هەرسێ مەرجەعەکە فەتوای خۆیان پێشکەش بە بەڕێز ڕاوی کرد کە پێویستە ئەم شیوعیانە بکوژرێن، چونکە هەڵگەڕاوەن لە دین، بەڵام تەنها سەیید حەکیم ئەوەی کردبوو بە مەرج کە دەبێ لێیان بکۆڵدرێتەوە بۆ جیاکردنەوەی ئەوانەی فێڵیان لێکراوە و خەڵەتێنراون، چونکە شیوعیەکان بۆ هەندێ لەوانەی نەزان بوون و شوێنیان کەوتبوون، وایان دەردەخست کە حیزبێکی شیعەن، لە کاتێکدا بەعسیەکان خۆیان وا نیشان دەدا کە حیزبێکی سوننین، بۆیە سەیید حەکیم جەختی کردبووەوە لە سەر

ئـەوەی کـە دەبـێ حکومـەت ئـەوە جیـا بکاتـەوە کـە شـیوعیە بـە عەقیـدە و شارەزایە بەوەی کە شوێنی کەوتووە، ئەوەشی کـە خەڵـەتێنراوە و شـیعەیە و پێی وایە ئەوە حیزبێکی شیعەیە و هیچ ناکۆکیـەك نییـە لـە نێـوان ئـەوەی کـە شیوعی بن و لە هەمانکاتدا مسوڵمان بن، بـەڵام هـەردوو شـێخی تـر خالـصی و واعیز فەتواکانیاندا بە پێویستبوونی کوشتنی هـەموو شـیوعیەك بـەبێ تەحـەفوز، یاخود هـیچ مـەرج و شـەرتێك، بـەڕێز ڕاوی بـرادەری مـن بـوو دەهـات بـۆ ئـەو مزگەوتە بچکۆلانەیەی من تیایدا وتـاری هـەینیم دەخوێنـدەوە، لـە کـەڕڕادەی ڕۆژهەڵات کە نـاوی مزگـەوتی (أبـو أقـلام) بـوو، مزگـەوتی حاجیژنـە حەسـیبە پاچەچی بوو، بەڕێز ڕوای زۆرجار دوای نوێژ سەلامی لێدەکردم، هەندێجار دوای نوێژی جومعـە لەگەڵمـدا دەمایـەوە و قـسەمان دەکـرد، زۆر خۆشـحاڵیی خـۆی دەردەبـڕی بەرامبـەر وتارەکـانم، بۆیـە بڕیاریـدا کـە دوای سـەعات دووی ئـەو بەیانیەی کە دەبوایە بچێت بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکە بێت بۆ ماڵـەکمان کـە بە تـەنیشت مزگەوتەکەوە بوو، واتە پێش پێنج سـەعات لـە چـوونی بـۆ نـوگرە سەلمان بۆ ئەوەی ئەو بابەتەم لەگەڵد باس بکات، وە فەتوای منـیش وەرگـرێ و ببێت بە چوار فەتوا لـەلای، دوانـی ئیمامـانی شـیعە و دوو فـەتوای ئیمامـانی سوننە، بەڵام دیاربوو ئەوە بە بیریـدا نـەهاتبوو کـە لەوانەیـە مـن ڕای جیـاوازم هەبێ لـەوان، چـۆن؟ مـن گـەنجێك بـووم و پێویـست بـوو کـە زۆر توندوتیـژ بم بەرامبەر هەر فیکرێك کە دژی فیکری ئیسلامیی بێت، سەرەڕای ئەوەش من لـە سـەردەمی عەبدولکـەریم قاسمـدا زینـدانیی کرابـووم بـۆ ماوەیـەکی زۆر و شیوعیەکان زیاتر لە جارێك خەریك بوو بمکوژن، دوای ئەوە چـەندین فـەتوا لـە لایەن زانایانی عێراقەوە دەرچوو بوو دوای ئەو قەسابخانانە و کوشت و بڕانـەی کە شیوعیەکان و لایەنگرانی ئاشتی و گەنجـە دیموکراتخوازەکـان و بـەرەنگاری

شـەعبی پێـی هەسـتابوون، ئـەو زانایانـە لـە فەتواکانیانـدا ئـەوەیان دووپـات کردبـووەوە کــە شــیوعیەکان و بــەرەنگاری شــەعبی و لایــەنگرای ئاشــتی هەڵگــەڕاوەن لــە دیــن و ئەوانەشــی شــوێنیان بکــەون وەکــو "گــەنجانی دیموکراتخـواز" ئـەوا و حـوکمی ئـەوانیان هەیـە، بۆیـە دانیـشت لـەلام و باسـی بابەتەکـەی بـۆ کـردم و وتیـشی کـە سـەرۆکی وڵات (عبدالـسلام عـارف) و جێگرەکـەی و سـەرۆك وەزیـران (أحمـد حـسن البکـر)ی بەعـسی جـەختیان کردووە لەسەر پێویستیی کوشتنی هەموو شیوعیەکان، وتیـشی کـە نابـێ ئـەم بابەتە لەوە زیاتری پێ بچێت بۆ ئەوەی ڕووسیا هەڵی ئـەوەی دەست نەکـەوێ کە فشار بخاتە سەر حکومەتی عیراقی، تـەنها ئەوەنـدە بەسـە کـە پرسـیار لـە هەر یەکێکیان بکرێت کە ناوی چییە؟ لە کوێ دادەنیشێ؟ کەی پەیوەنـدی بـە ڕیزەکــانی حیزبــی شــیوعی یــان لایــەنگرانی ئاشــتی یــاخود گــەنجانی دیموکراتخـوازەوە کـردووە و دواتـر فـەرمان بـە فەصـیلەی ئـاگر دەکـات لـە سێدارەی بدەن.

منیش لێمپرسی: ئەی بۆچی هاتووی بۆلای من؟ لە کاتێدا من دەرچوویەکی تازەم و هێشتا ناوبانگم نییە و کەس نامناسێ، ئیتر فـەتوای مـن چ گرنگیـەکی هەیە لە پاڵ فەتوای ئەو ئیمامە گەورەو ناودارانەدا؟ ئـەویش وەڵامـی دامـەوە: بۆ ئەوەی دڵنیا ببێ، ئەو — بەگووتـەی خۆی — متمانەی بەمن هەیـە و زۆربـەی نوێژکان لە دوای منەوە دەکات، پێیوایە کە فەتواکەم ورد و دروستە، بەڵام من وتم: ئەگەر بڵێم ئەو کارە حەرامە لە ڕووی شەرعەوە دەتوانی ئەنجامی نەدەیت لە کاتێکدا هەموو ئیجرائاتێکتان گرتۆتەبەر؟ تۆش پیاوێکی سەربازییت؟ وتـی: ناتوانن زۆرم لێبکەن بۆ ئەنجامدانی ئەگەر ڕازی نـەبم و یـەکێکیتر دەنێـرن، وتم دەکەواتە ئەوە چ تۆمەتێکە کە ئـەم ژمـارە زۆرەی لەسـەر لەسـێدارە دەدەن؟

وتی: هەڵگەڕانەوەیە لە ئیسلام، وتم: باشە ئەگەر ئەمانە دژی باڵی میشیل عەفلەق و حیزبی بەعس کۆدەتایان نەکردایە و هەڕەشەیان نەبووایە بۆ سەر دەسەڵات، ئایا بەم شێوەیە لە سێدارە دەدران؟ وتی: نەخێر، وتم: کەواتە کێشە سەرەکیەکە پەیوەندیی بە دینەوە نییە، بۆچی دین تێکەڵی ئەو مەسەلەیە دەکەن؟ وتی: ئەی ناتوانرێ ئەم تاوانە بە دوولایەن لێك بدرێتەوە کە لایەنێکیان سیاسی و ئەویتر ئایینی بێت؟ ڕووە ئایینیەکەی بریتی بێت لە هەڵگەڕانەوە، ڕووە سیاسیەکەشی دژایەتی حیزبی بەعس و هەوڵی کۆدەتا بێت؟ بە هەرحاڵ ئەمە هەلێکە و دەستمان کەوتووە بۆ تۆڵەسەندنەوە لێیان لە هەموو ئەو تاوانەی کە لە سەردەمی حوکمی عەبدولکەریم قاسمدا ئەنجامیان داوە.

وتم: با موناقەشەی لایەنە ئایینیەکەی بکەین و بگەینە ئەنجامێك، دواتر باسی لایەنە سیاسیەکەشی دەکەین، بۆیە چووم پەیڕەوی حیزبی بەعسی عیراقیم بۆ هێنا، هەڵبەت باڵی میشیل عەفلەق پێش ئەوەی هەندێ گۆڕانکاریی تیادا بکەن، ماددەی یەکەمی دەڵێ: حیزب بڕوای بە مارکسیەتی لینینی هەیە بە جێبەجێکردنی عەرەبیانە، وتم: ئەگەر شیوعیبوون بنچینەی سەرەکیی مارکسیەتی لینینی بێت، ئەوا بە عسیەکان لە شیوعیەکان زیاتر بڕوایان پێیەتی، بەڵام شیوعیەکان ئومەمین و بەعسیەکان عەرەبین، واتە بەعسیەکانی عیراق شیوعین و یەشماغ و عەگال و کوفیە دەبەستن، شیوعیەکانیش سەرڕووتن، سەرەڕای ئەمەش لە ماددەی نۆی هەمان پەیڕەودا هاتووە کە: "میرات وماڵبەخشین بە میراتگر بە دەسکەوتێکی نامەشروع و ناتەندروست دادەنرێ" وتم: دەزانی ژمارەی ئەو ئایەتانەی باس لە میرات و ڕێکخستنی دابەشکردنەکەی دەکەن، دەگاتە نزیکەی چل و هەشت ئایەت لە قورئاندا؟ ئەم

ماددەیە دژایەتی هەموو ئەم ئایەتانە دەکات و بەتاڵیان دەکاتەوە، بەڵکو دژایەتی ماناکانیشیان دەکات، ئەگەر مەسەلەکە هەڵگەڕانەوە بێت ئەوا بەعسیەکان هیچیان کەمتر نییە لە شیوعیەکان، بۆچی خۆت دەکەی بە داردەستێك بۆ لە ناوبردنی هەڵگەڕاوەیەك لە پێناوی هەڵگەڕاوەیەکی تردا؟ دواتر وتم وانازانی ئەمانە بیانەوێ خەڵکی چەواشە بکەن لەم قۆناغەدا و خۆیان بدەنە پاڵ ئیسلام تا شوێنیان قایم و پتەو دەبێ؟ ئەی ئەزانی کە دووان لە هەرە پیاوە بەرزەکانی بەعس کە عەلی صالح سەعدی ئەمینسڕی قیادەی قوتری و عەبدولکەریم مستەفا نوصرەت پێش سێ ڕۆژ لەمەوبەر لەکاتی سەر خۆشیاندا جنێویان بە خوای بەرز و باڵا و بە دین داوە؟ ئەوەی ناشێ لە کوفر کردوویانە؟ لەوانە وتوویانە: ترسنۆکەکان دەیانوت ئەگەر خوا نەبووایە ئەم شۆڕشە سەری نەدەگرت، ئەی کوا خوا ئێستا لە کوێیە؟ خۆ نە ئابوونەی داوە و نە بەشداریی دانیشتنە حیزبیەکانیشی کردووە، دوایی فیشەکیان ناوە بە ئاسمانەوە، وتم: توخوا ئەمە هەڵگەڕانەوە نییە؟ ئەگەر چەمکی هەڵگەڕانەوە لای ئەوانە ڕوون بێت؟

ئەو پیاوەش وتی: ئەی چۆن ئەم زانا بەرزانە فەتوایان داوە بەبێ لێکۆڵینەوە؟ وتم: پرسیارەکەیان بۆ وا لێکراوە کە تەنها باسی بە کافرکردن و هەڵگەڕانەوە کراوە، بەڵام من دەزانم کە ئیسلام ئایینی پاککردنەوە و تەزکیەیە نەك ئایینی بە کافردانان، بۆیە بۆ کوشتنی خەڵکی نەهاتووە، بەڵکو بۆ پاککردنەوەی ئەقڵ و هۆشیان هاتووە لە بێبڕوایی و هاوەڵدانان، هەوڵی ئەوەی داوە خەڵکی وا لێبکات ئەو ئەقڵەیان بە چاکی و لە شوێنی خۆیدا بەکار بهێنن بۆ گەیشتن بە ڕاستی، ئەگەر ئەم لایەنەت بۆ ڕوون بۆتەوە با بچمە سەر لایەنە سیاسیەکەشی؟ لێرەدا من نابم بە موفتی، بەڵکو ڕای خۆم دەردەبڕم، لەوانەیە

وابێ و لەوانەشە وانەبێ، وتم: بەعسیەکان دەزانن کە تۆ کەسێکی نوێـژخوێنی، باوکـت لـە زانابـەرزەکان بـووە، بنەماڵەکەشـتان بـە ئـایین پـەروەر ناسـراون و مێژوویەکی ئایینیتان هەیە، لەناو ئەفسەرەکاندا تۆ بـە گـورج و گـۆڵی و هەڵپـە ناسـراویت، بۆیـە بەعـسیەکان باشـیان هەڵبـژاردووە، چـونکە دەیانـەوێ تـۆو ئەوانەی لە ناو سـوپادا بـە مـسوڵمان و دینـدار ناسـراون تۆمـەتی خوێنرێـژی و وەحشیگەری و لە ناوبردنی پێشکەوتووخوازانتان بدەنە پـاڵ، ئێـستا بـەیانیان ئامـادەکردووە بـۆ ئـەوەی سـبەی ئێـوارە بـڵاوی بکەنـەوە دوای ئـەوەی تـۆ ئاگاداریان دەکەیتەوە لەوەی کارەکەت ئەنجامداوە و شیوعیەکانت کوشـتووە، تاوانبارت دەکەن بەوەی کە خوێنرێژ و شێت و داخ لەدڵیت و کۆنەپەرسـتیت و هەندێ لایەنی کۆنەپەرست هانیان داوی بۆ ئەو کارە بێ فەرمانی سەرکردایەتی و هەڤاڵانی پێشکەوتووخوازت لەناو بردووە، بێگومان بە لەوەش کە لە ناو ئـەو سەربازانەی تۆ دەیانبەی بۆ کوشتنی ئەوانە کەسانێك فـەرمانیان پێکـراوە کـە دوای تەواوبوونی کردەوەکە بتکوژن یـاخود دەسـتگیرت بکـەن، دوای ئـەوەش هەڵدەستن بە پاککردنەوەی هێزە سەربازیەکان لە کەسانی ئیسلامیی و دینـدار دوای کۆتاییهێنان بە شیوعیەکان، بەم شێوەیە لـە دوو دوژمنـی کـۆنی خۆیـان ڕزگاریان دەبێ بەیەك لێدان، فەتوای ئەو زانایانەش ڕێگایـەکی بـاش دەبـێ بـۆ ئەوەی ئەو تۆمەتە بدەنە پاڵ ئیسلامییەکان، لەوانەشە دوای ئـەو کـارە کـۆڕی ماتـەمینی بگێـڕن بـۆ هـاوڕێ لەدەسـتچووەکانیان، بـۆ زیـاتر چەواشـەکردنی خەڵکی.

بەم قسانە ئەو پیاوەش هاتەوە هۆش خۆی و هەستی بە کۆمەڵێك شت کرد کە لەوەو پێش بە هیچ شێوەیەك حسابی بۆ نەکردبوون، بۆیە بڕیاریدا بە پەلـە بچێت بۆ کۆشکی کۆماریی و داوای لێبوردن بکات کە ناتوانـێ کارەکـە ئـەنجام

بدات، پێشمووت: ئەگەر پلانەکەیان ئەوە نەبێ کە من بۆی چووم ئەوا لە جێگای تۆ کەسێکی تر دەنێرن و هەزاران خوێنڕێژیان هەیە ئەو کارەی پێبکەن، ئەنجامیشی دەدەن، بەڵام ئەگەر وازیان هێنا و نەیانکرد ئەوا قسەکەی من ڕاست دەردەچێ، بەڵام تکام لێکرد کە ناوی من نەهێنێ لایان، چونکە ئەگەر بیانزانیایە کە من پەشیمانم کردوویتەوە و وام لێکردووی ڕات بگۆڕی، ئەوا واوەیلا بە حاڵم، بۆیە ڕۆیشت و داوای لێبوردنی کرد و ئەم هەڵەی لەدەست دان لە پێش هەموویانەوە لە دەستی (عبدالسلام عارف) و بەکر و قیادەی قوتریی، کارەکەش دوای ئەوە هەرگیز ئەنجام نەدرا بەو شێوە کۆمەڵکوژیە، هەرچەندە دواتر بە شێوەی تر و لە شەڕی عیراق و ئێران و کوەیتدا ئەنجام درا، دوای چەند هەفتەیەك میشیل عەفلەق خۆی بابەتێکی نووسی و هەموو ڕۆژنامەکانی بەغداد بڵاویان کردەوە و لە تەلەفیزیۆن و ڕادیۆکانیشدا چەند جارێك خوێنرایەوە، تیایدا داوای لە شیوعیەکان کردبوو پەیوەندی بە حیزبی بەعسەوە بکەن و هاوپەیمانی بن، بۆ ئەمەش کۆمەڵێك هۆکاری باس کردبوو لە پێش هەموویانەوە ئەوە بوو کە حیزبی بەعس توانیویەتی کۆمەڵێکی زۆر لە هاوڕێیانی حیزب بپارێزێ لە پیلانێکی کۆنەپەرست کە هەوڵی لەناوبردنیانی دەدا، ئەگەر هەڵوێستی ئازایانەی حیزب و سەرکردایەتیەکەی نەبووایە کە نەیهێشت ڕووبدا و لە کۆتا ساتەکانیدا فریایان کەوت، ئەوا هەموو هاوڕێیانمان لە مردووان دەبوون.

دوای ئەم ڕووداوە وشەی هەڵگەڕانەوە لە لای من زۆر ترسناك بوو دەرکەوتە و ئەنجامی زۆری لە سەر ئەقڵ و دەروونم بەجێ هێشت، بۆیە تەنها تاوانێك نەبوو کە لە فیقهی ئیسلامییدا سزای بۆ دانرابێ، یان حەددێك یان هیچی نەبێ، ئایا هەڵگەڕانەوە ڕادەربڕینە؟ یاخود دەستدرێژیکردنە سەر

کۆمـەڵێك و مـافی گـشتی؟ ئایـا ئیجمـاع هەیـە لەسـەر واجببـوونی کوشـتنی هەڵگەڕاوە؟ یاخود مەسەلەکە خیلافییە؟ ئایـا دەکـرێ مـافی تـاك پـێش مـافی کۆمەڵگا بخرێ لە دەربڕینـی ڕای ئـازادی خۆیـدا؟ یـاخود کۆمـەڵگا بـۆی هەیـە پارێزگاری لە موقەددەسات و پیرۆزیەکانی خۆی بکـات؟ ئـەم پرسـیارانە دێنـە خەیاڵـەوە، یـاخود هـەر نایـەن، بـەڵام گـرنگترین شـت کـە دێتـە نـاو خـەیاڵ و بیرکردنەوەی مـن کاتێـك باسـی هەڵگەڕانـەوە دەکـرێ مەسـەلەی پیلانگێڕییـە، پیلانـی دەوڵـەت ـ بـەردەوام و بـە خـراپترین شـێوە ـ دژی ئـازادی، جـا تاکـە کەسێك بەرپای بکات یاخود حیزب و کۆمەڵێك یا هەموو جیهـان، ئـەوە پیلانـی دیکتاتۆریەتی تاوانبار و ستەمکارە دژی نـەیار و ڕاجیاوازەکـان لێـی، جـا هـەر کەسـێك بـن، ئــەوە پیلانــی ســتەمکارە زۆردارەکانــە بــۆ دوورخــستنەوەی چەوسـاوەکان و یـاریکردن بـە دواڕۆژیـان، نـەك تـەنها لـە دنیـا بـەڵکو بـە هـی دواڕۆژیشیانەوە ئەگەر بتوانن، ئـەوە هـەوڵی کوشـتن و لـەناوبردنی بەنـدەکانی خوایە بە درۆکردن بە دەم خواوە، قۆرخکردنی دەسـەڵاتەکانی و ئیـدیعاکردنی نوێنەرایــەتی خــوا و قــسەکردن بــە نــاوی ئــەوەوە بــە گــۆڕینی هیدایــەت و ڕێنموییەکانی، ئەوە پیلانی دەسەڵاتخوازانە ئەوانەی خۆیـان فـەرز کـردووە بـە سەر ئیرادەی خەڵکیدا دژی نەیارانێك کە هیچیان نییـە جگـە لـە زمانیـان، کـە ئـەویش زۆرداران دەیانـەوێ بیـبڕن کاتێـك باسـی پاڵەوانیەتیـەکانیان ناکـەن و سوپاسیان ناکەن.

ئەم شـتانە و زۆر شـتی تـریش دێـن بـە بیرمـدا کاتێـك باسـی هەڵگەڕانـەوە دەکرێ، بۆیە بڕیارمدا لەسەری بنووسم، ئەوەی پەیوەندی پێیەوە هەیە لێکـی بدەمەوە، هەرچەندە پێموایە زۆر دوام خست لەبەر هۆکارگەلێك.

ڕەشنووسی ئەم بابەتەم لە ساڵی ١٩٩٢دا ئامادەکرد، کۆمەڵێك برا زۆریان لێکردم بڵاوی بکەمەوە کە ئەوکاتە لە سنووری سەد لاپەڕەیەکدا بوو، بەڵام هەندێك پێیانوابوو کە بڵاوی نەکەمەوە لە ترسی "پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی" کە ئەوکات من سەرۆکی بووم، نەکا بە هەڵوێستی من زەرەرمەند ببێ، دوایی لە ساڵی ١٩٩٦دا وازم لە سەرۆکایەتیەکەی هێنا پێیان وتم: جارێ واز بهێنە لە ترسی ئەو زانکۆیەی کە سەرۆکایەتی دەکەی، دوای ئەوەش شەش ساڵ ڕۆیشتو تەمەنم چووە پێشەوە و نەخۆشی زۆر بوو، بۆیە نامەوێ بچمە لای خواو ئەم زانستە بشارمەوە کە خوا پێی داوم، چونکە ئەوەی زانستێك بشارێتەوە ئەوا خوای گەورە ڕۆژی قیامەت بە لغاوێکی ئاگر لغاوی دەکات.

نامەوێ وەکو کەسانێك بم کە دەیانوت "ئەوەی لە ناخمدایە ئەگەر بیدرکێنم ئەوا هەردوو چاوم دەردەهێنن"، دوایی دەمرێ و نهێنیی زانستەکەی لەگەڵیدایە، هەروەکو چۆن نامەوێ ئەوەی دەیزانم بیشارمەوە لە ترسی دووبەرەکی و ئیختیلاف، چونکە پێم وانییە کە خراپتر هەبێ لە دووبەرەکیی فیرقەیەی کە زانایانی نەزان و دەسەڵاتدارانی زۆردار بەدییان هێناوە، دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکانی ئەم ئوممەتە باشترە بە پشتیوانی خوا لە شاردنەوەی، هەرکەسێك ئەم بابەتەی منی خوێندەوە، ئەگەر چاکەیەکی تیا بینی با دوعای خێرم بۆ بکات، ئەگەر جگە لەوەی بینی با بۆم بنووسێ و عەیبەکانم بۆ بنێرێتەوە، بە پشتیوانی خوا چارەسەری دەکەم یاخود بە گفتوگۆی زانستیانەی بەپێز قسەی لەسەر دەکەین، داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم لە تاوانەکانم، هیچ پشت و پەنایەکم نییە جگە لە خوای گەورە، خوا دەیزانێ من عەشقی کەلەپووری ئەم ئوممەتەم و خۆم بە خاوەنی دەزانم و

پێموایە هەندێ شتی هەیە کە دەبێ پیایدا بچینەوە و ئەوەش پاکی دەکاتەوە، کەلەپوورێکی دەوڵەمەنـدە و جۆراوجـۆرە و لـە پێداچـوونەوە و ڕەخنـەلێگرتن ناترسێ و ئێمەش نابێ بترسین.

وهل أنا إلاّ من غزيّة إن غوت غويت وإن ترشد غزية أرشدِ

واتە من لە هۆزی غەزییەم و بە هەموو شـێوەیەك لەگەڵیـدام ئەگـەر سـەری لێشێواو خراپەی کرد لە گەڵیدام و ئەگەر ئەویش چاکەی کرد ئەوا دەیکەم.

## مەنهەجەکەم

لـە هەمانکاتـدا جـەخت لەسـەر ئـەوەش دەکەمـەوە کـە - بـە پێـی توانـا - پابەندبم بە مەنهەجی زانستیی لە لێکۆڵینەوەدا، ملی هیچ دەقێك یان بەڵگەیەك ناگرم بیسووڕێنم بـەلای فیکرەیەکدا کـە پـێش نووسـین هـەمبووبێ، هـەروەها زەینم پاك دەکەمەوە لە هەموو بۆچوونێك یان هەڵوێستێك کە پێـشتر لەسـەری بـووبم، یـان هـی یـەکێکی تـر بووبێـت و بـە لامـەوە پەسـەند بووبـێ، بەڵگـە شەرعییەکان دەکەم بە سەرچـاوەی ئـەوەی بڕیـاری لەسـەر دەدەم، نـەك ئـەو بەڵگانە بهێنمەوە کە شاهیدیی دەدەن لەسەر قسەکانی مـن، وەکـو زۆرێـك لـە نووسەران دەیکەن، چونکە لەلای من گـرنگ ئەوەیـە بگەینـە ئـەو مانایـەی کـە بەڵگـە شـەرعییە بـەپێزەکان دەیگەیـەنن، نـەك وەکـو ئـەوەی لەگـەڵ داهـاتوو ئێـستادا بیـانگونجێنین، بۆیـە باشـترین مەنهـەج کـە بـەکاری بهێـنم لـەم لێکۆڵینەوەیەدا مەنهەجی فەلـسەفیی ئوصـوڵی و مەنهـەجی شـیکردنەوەیە بـە یەکەوە، هەروەها هەڵگۆستنی مێژوویی بـەبێ لـەبیرکردنی مەنهەجـە تەقلیدیـە باوەکـان لـە لێکۆڵینـەوەی زانـست و مەعریفـەی نەقڵیـدا، لـە سـەردەمی نووسینەوە و لە دواییشدا، لە تەفسیردا پەنا دەبەینە بەر ئەوەی کە شارەزایان

بڕیاریـان لەسـەر داوە لـە ئوصـولْ و مەنهەجدا، لـە کێشی فـەرموودە و بڕیـار لەسـەردانیدا مەنهـەجی فەرموودەناسـان وەردەگـرین و.. بـەم شـێوەیە، لـە ئوسولێـشدا مامەڵـە لەگـەڵ کتێبـی پـیرۆزی خـوادا دەکـەین بـەو پێیـەی کـە سەرچاوەی دامەزرێنەری ئەحکام و دەرخـەری حوکمەکانـە (إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّـهِ) (یوسف: ٤٠)، ئەمەش بۆ کارکردن بە حاکمیەتی کتێبی خوا، واش لە سوننەتی پێغەمبەرﷺ دەڕوانـین کـە ڕوونکـەرەوەی قورئانـە بـە شـێوەی پێویـستبوون (الإلزام)، بـەڵام بانگەشـەی ئیجمـاع وەرنـاگرین دەربـارەی ئـەو بابەتانـەی کـە هاوەڵان لەسەری ناکۆك بوون، کـۆدەنگیی ئـەوان هـی خۆیانـە، بـەڵکو سـەیری مەبەستەکانی شـەریعەت و بـەها گـەورەکان دەکـەین (مقاصـد الـشریعة والقـیم الحاکمة)، لەو سۆنگەیەوە کە بەڵگەی گشتی و سەرچاوەی ڕووناککەرەوەن بـۆ کەسـی بەڵگەهێنـەرەوە لـە کـاتی مامەڵەکردنیـدا لەگـەڵ دەلالـەتی بەڵگـە بەشەکیەکان (الأدلـة الجزئیـة)، نـەك وەکـو ئـەوەی کـە تـەنها شـتە باشـەکانی شەریعەت بن، قورئان چۆن چەمك و وشـە زمانییـەکانی بـەکارهێناوە، ئێمـەش ئاوا وەریدەگرین، ئینجا ئـەوەی ڕوونکردنـەوەی پێغەمبـەرەﷺ بۆیـان، دواتـر پەنا دەبەینە بەر ئەوەی کە چۆن عەرەب بەکاری هێناون لـە زمـان و شـێواز و بەیانـدا، بـۆ ئـەوەی تـەنها قـسەی عـەرەب لـە ماناکـانی قورئانـدا نەبێتـە لێکدەرەوە، ئەگەر خوای گەورە یارمـەتی دایـن بـۆ ڕێگـای ڕاسـت ئـەوا فـەزڵی خۆیەتی، ئەگـەر وانـەبوو ئـەوا مـرۆڤ خـۆی لاوازە و ئـەهلی لـە بیرچـوونەوەیە، تەنها ئەوەمان بەسە کە مەبەستمان خێـرە لـەم کارەمانـدا، تـەنها ئیـسڵاحمان دەوێ ئەگەر بتوانین، بۆیە داوا لە خوای کاربەجێ دەکەین یارمەتیمان بدات لـە قسەو کردەوەدا، هەروەها لە سەرشێتکردنەکانی شەیتان بمان پارێزێ:

وَمَن ذا الذي تُرْضِي سَجاياهُ كلُّها كفى المرءُ نُبْلاً أن تُعدّ معايِبُه

کێ هەیە هەموو سروشت و خووەکانی خەڵکی ڕازی بکات، بەسە بۆ کەسێك فەزڵ و گەورەیی کە عەیبەکانی بژمێردرێن، واتە ئەوەندە عەیبی کەم بێت خەڵکی بتوانن بیانژمێرن.

## سنوورەکانی لێکۆڵینەوەکە و کێشەی سەرەکی

ئوصوڵیەکان وا ڕاهاتوون کە لە کاری ئیجتیهاددا هەستن بە بەدیهێنانی مەبەست (تحقيق المناط) دوای جیاکردنەوە و لە بێژینگدانی، لە جیاوازی و بوونی نەیاریی و ناڕەزاییشدا شوێنی ناکۆکیی دیاری بکەن، ئێمەش لەسەر مەنهەجی ئەوان کێشەی باسەکە دەخەینەڕوو، لە سەرەتاوە بۆ ئەوەی شتەکان لە بەرچاوی خوێنەر تێکەڵ نەبن:

١ ـ ئەم باسە چارەسەری کێشەی کافربوونی هەڵگەڕاوە لە دین ناکات، یاخود دەرچوونی لە بازنەی ئیسلام دوای ئەوەی قبوڵی کردووە و بڕوای پێهێناوە، کافربوونی ئەم کەسە ئاشکرا و ڕوونە و هیچ کێشەیەکی لەسەر نییە، جا ئەو کەسە دینێکی تری هەڵبژاردبێ و چووبێتە سەری، یان بە بێ بڕوایی و بێدینی مابێتەوە.

٢ ـ ئەم باسە ڕێگا ناگرێ لە سزادانی هەڵگەڕاوە کە هەر تاوانێکی تر ئەنجام بدات، دژی کۆمەڵگا یان شەریعەت یاخود سیستەم و نەریتەکانی ئایین، یاخود یاخیبوون لە کۆمەڵگا و حاکمە شەرعییەکانی، هەر تاوانێك کە بیکات جا لەبەر ئەوە بێت کە مورتەددە و لە دین دەرچووە، یاخود لە بەر هەرشتێکی تر بێت ئەنجامی بدات، ئەوا ئوممەی ئیسلامیی و دەسەڵاتداران بۆیان هەیە سزای بدەن لەسەر تاوانەکەی بە پێی ئەو سزایانەی کە دەیگرنەوە، ئەویش لەگەڵ خەڵکیدا یەکسانە لەو بابەتەدا، چونکە هەڵگەڕانەوە ئەگەر تاوانەکەی

لەسەر زیاد نەکات ئەوا لێی کەم ناکاتەوە، وەك ئەوەی بوو ترێ مادام هەڵگەڕاوەتەوە و لە دیندا نەماوە ئەوا هیچ سزایەکی تر نایگرێتەوە.

٣ ـ کێشەی سەرەکیی ئەم بابەتە بریتییە لە (هەڵگەڕانەوەی تاکە کەس) واتە: کەسێك عەقیدەکەی بگۆڕێت و لەگەڵیشیدا فیکر و بۆچوون و هەڵسوکەوتی بگۆڕێ، ئەمەش نەکاتە بیانوو بۆ دەرچوون لە کۆمەڵ و سیستم و ئیمامی مسوڵمانان و چەك هەڵنەگرێ دژی دەوڵەتی ئیسلامیی، هەروەها نەچێتە پاڵ دوژمنەکانی بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکان، خیانەتی لێدەرنەکەوێ، بەڵکو ئەوەی کردبێتی تەنها گۆڕینی هەڵوێستی عەقیدیی بێت، گومانی بۆ دروست ببێ دەربارەی بیرو باوەڕی ئیسلامیی و نەتوانێ ئەو گومانانە بڕەوێنێتەوەو لە دڵی دەریان بکات، دواتر تەسلیمی ئەو گومانانە ببێت و بکەوێتە شوێنیان و نەبێتە بانگەشەکار بۆ هەڵگەڕانەوەکەی، ئایا بۆ کەسێکی ئاوا حوکمێکی شەرعیی هەیە لەسەر کافربوونەکەی بە شێوەیەك واجب ببێ لەسەر ئوممەت کە حەددی خوای لێدەرکەن و بیکوژن، جا تۆبە بکات یان نا، ئەگەر هاتوو ئەم ئایین گۆڕینە هیچ تاوانێکی تری لە پاڵدا نەبێ؟ ئەی ئەگەر هاتوو کەسێکی ناو کۆمەڵگای ئیسلامیی هەستا بە کوشتنی ئەو کەسە، ئایا تۆڵەی لێناسەنرێ و بە هۆیەوە ناگیرێ؟ هیچی لەسەر نابێ تەنها ئەوە نەبێ کە بەبێ پرسی دەسەڵات ئەو شتەی کردووە و لەسەر ئەوە سزا بدرێ؟ ئایا لەسەر ئوممەت پێویستە ئەمانەو هاوشێوەکانیان بە زۆری زۆرداریی بگێڕێتەوە بۆ ناو ئیسلام؟ ئەگەر شتێکی ئاوا ڕوویدا بە زۆر کەسێکیان هێنایەوە ناو ئیسلام، ئایا قورئان قبوڵی دەکات؟ ئەی حوکمی واجببوونی کوشتنی هەڵگەڕاوە لە هەموو سەردەم و کاتێکدا ئیجماعی لەسەر بووە؟ یان جیاوازی هەبووە، بەڵام بە شێوەیەکی تەواو دەرنەکەوتووە؟ ئەگەر وترا

هەڵگەڕاوە دەکوژرێ، ئایا تەنها کافربوون دەبێتە هۆکار بۆ کوشتن لە ڕووی شەرعەوە؟ ئایا سزای تایبەت بە هەڵگەڕانەوە لەلای ئەوانەی دەڵێن جێبەجێ بکرێ، تاوانێکی سیاسییە یان دەچێتە خانەی تاوانی گشتییەوە تا حوکمی شەرعی وەرگرێ؟ لە هەمووشی گرنگتر، ئایا ئەم حەددە شەرعییە ـ ئەگەر بڵێین حەددە ـ بەکافرکردنی ئەو کەسەیە یان پاککەرەوەیە؟ چونکە ئێمە دەزانین دەرکردنی حەدد بۆ پاککردنەوەیە، ئایا هەڵگەڕانەوە دەرچوونە لە ئیسلام، یان دژایەتیکردنیەتی؟ ئەمانە کرۆکی بابەتەکەمانن، لەمانە لەو شتانەی تر کە پەیوەندیدارن بەم باسەوە دەکۆڵینەوە، بە پشتیوانی خوا، بەو مەنهەجەی کە باسمان کرد، داوای یارمەتی و ڕاستکردنەوە لە خوای گەورە دەکەین، یارمەتیدانمان بۆ گەیشتن بە ڕای ڕاست و دروست و قسەی بەجێ، تەنها ئەویش یارمەتیدەرە.

# حەقیقەتی هەڵگەڕانەوە
# وەکو چۆن ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز باسی دەکەن

له (لسان العرب)دا هاتووه: "ارتدَّ وارتدَّ عنه: تحوَّل"، وفي التنزيل: (مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ) (المائدة: ٥٤)، ناوەکەش بریتییە لە (الردة)، لەوەشەوە وتراوە هەڵگەڕایەوە لە ئیسلام واتە گەڕایەوە، هەروەها دەوترێ فڵان کەس لە دینەکەی هەڵگەڕایەوە واتە کافر بووەوە دوای مسوڵمانبوون. هەموو خاوەن موعجەمەکانی عەرەبی لەسەر ئەم مانایە کۆکن، هەروەها لە (أساس البلاغـة)دا هاتووە: "گەڕاوە بەرەو داوە هەڵگەڕاوەیە بەرەو دواوە، واتە گەڕانەوە بەو شوێن و ڕێگەیەدا کە لێوەی هاتووە، ئەمەش وتراوە بۆ هەموو کەسێك لە شتێك پەشیمان بێتەوە کە خێرو دینداریی تێدا بێت، لەمەشەوە لە سورەتی (الکهف)دا هاتووە: (فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصاً) واتە گەڕانەوە بەو ڕێگایەدا کە بڕیبوویان، بۆیەش بە هەڵگەڕاوە وتراوە چونکە لە دینەکەی پەشیمان بۆتەوە". بەکارهێنانی ئەم وشەیە ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤ کاتێك مسوڵمان دەبێت و تەسلیمی خوا دەبێت، وەکو ئەوە وایە ڕێگایەکی بڕیبێت بەرەو خوا و نزیك بووبێتەوە لێی، بەڵام کاتێك هەڵدەگەڕێتەوە ـ پەنا بە خوا ـ ئەوا وەکو ئەوە وایە لەو ڕێگایەوە گەڕابێتەوە کە لێوەی هاتووە بەرەو خوا، بۆیە گەڕاوە یان هەڵگەڕاوەی پێدەڵێن، (دیارە جیاوازیەك هەیە لە نێوان مانا عەرەبیەکە و کوردیەکەدا، بەڵام بەگشتی لە کوردیدا هەڵگەڕاوە بەکاردێت).

## ئەو ئایەتانەی بە بەڵگە دەهێنرێنەوە

## بۆ کافربوونی هەڵگەڕاوە

١ ـ (وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَـئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) (البقرة: ٢١٧)، بەتاڵبوونەوەی کارو کردەوەیان لە دنیاو قیامەتدا، پەنا بە خوا.

٢ ـ (كَيْفَ يَهْدِي اللّهُ قَوْماً كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُواْ أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ) (آل عمران: ٨٦)، لەدەستدانی هیدایەتی خوا و لە دەستدانی ئامادەیی بۆ وەگرتنی ئەو هیدایەتە.

٣ ـ (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ثُمَّ ازْدَادُواْ كُفْراً لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الضَّآلُّونَ) (آل عمران: ٩٠)، هەڵگەڕانەوە دوای مسوڵمانبوون، واتە دووبارەبوونەوە تۆبە لە خاوەنەکەی وەرناگیرێ.

٤ ـ (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ الأرْضِ ذَهَباً وَلَوِ افْتَدَى بِهِ أُوْلَـئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ) (آل عمران: ٩١)، لە کاتی مردن بە کافریدا هیچ کردەوەیەك لە دنیادا سزای تاوانەکەی لانابات، یاخود هیچ بەخشینێك سزای کافربوونەکەی لانابات، ئەمە جۆرێك لە گاڵتەکردنیشی تیایە، چونکە هەڵگەڕاوە لە کوێ پڕ بە زەوی ئاڵتوونی دەست دەکەوێ دوای مردنی تا بیکات بە هۆی سڕینەوەی تاوانەکەی.

٥ ـ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوَاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقاً مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ) (آل عمران: ١٠٠)، کێن ئەوانەی بێهێزەکان وا لێدەکەن لە دین هەڵگەڕێنەوە؟

٦ ـ (يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكْفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُواْ الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ) (آل عمران: ١٠٦)، هەندێك لەو سزا خراپەی کە چاوەڕوانی هەڵگەڕاوەکانە.

٧ ـ (إِنَّ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الْكُفْرَ بِالإِيمَانِ لَن يَضُرُّواْ اللّهَ شَيْئاً وَلهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ) (آل عمران: ١٧٧)، هەڵگەڕاوە لە دین تەنها زیان بە خۆی دەگەیەنێ.

٨ ـ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ) (المائدة: ٥٤)، هەڵگەڕاوە خوای گەورەی خۆش ناوێت، ناشتوانێ هیچ زیانێکی پێ بگەیەنێ، خوای گەورە دەیانگۆڕێت بە خەڵکانی باشتر لەوان.

٩ ـ (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ آمَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ازْدَادُواْ كُفْراً لَّمْ يَكُنِ اللّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلاَ لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلاً) (النساء: ١٣٧)، کەسێك چەند جارێك هەڵگەڕێتەوە و بێتەوە ناو ئیسلام ئەوا هەرچیەك بکات لێخۆشبوونی خوا بە دەست ناهێنێ.

١٠ ـ (مَن كَفَرَ بِاللّهِ مِن بَعْدِ إيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَـكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْراً فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (النحل: ١٠٦)، کەسێك زۆری لێدەکرێ بۆ ئەوەی لە دین هەڵگەڕێتەوە و هیچ دەسەڵاتی نییەو کار ناکاتە سەر ئیمانی، مەگەر خۆی بە ویستی خۆی کافرببێ و سنگی بۆ بکاتەوە.

١١ ـ (وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ) (الحج: ١١)، لاوازیی ئیمان و کەمیی دڵنیایی و بەندایەتی نەکردن بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لە سەرەکیترین دەروازەکانی هەڵگەڕانەوەن.

١٢ ـ (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَشَاقُّوا الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الهُدَى لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئاً وَسَيُحْبِطُ أَعْمَالَهُمْ) (محمد: ٣٢)، بێبایەخیی هەڵگەڕانەوە لە خوا و هەڵوەشانەوەی کردەوەی کافر ئەو ئەنجامەیە کە چاوەڕوانی دەکات.

ئەم ئایەتە پیرۆزانە هەموویان هاوبەشن لەوەدا کە حەقیقەتی هەڵگەڕانەوە ئاشکرا دەکەن، بە ناو و چەمکەوە، کە بریتییە لە گەڕانەوە لە ئیسلام و ئیمان دوای وەرگرتن و قبوڵکردنیان، هەروەها بڕوابوون بەو شێوەیەی کە خوای گەورە داوای کردووە، ئەم هەڵگەڕانەوەیەش کە بە (الردة) ناسراوە، مەبەست لێی پاشگەزبوونەوەیە لە ئیسلام و ئیمان جا بۆ ئایینێك بێت کە پێش ئیسلام کەسەکە بڕوای پێی هەبووبێ، یان وەرگەڕان بێت بۆ ئایینێکی تر جگە لەو دووانە، یاخود هەر بێبڕوایی بێت و ئیمان هێنان نەبێ بە هیچ دینێك، هەموو ئەمانە پاشگەزبوونەوەن لە ئیسلام و بە هەڵگەڕانەوە دادەنرێن.

بەمەش دەردەکەوێ کە "الردة" و "الارتداد" لە واتای قورئانییدا جیابوونەوە لەوەی کە پێشتر پێگەیشتبێت، قورئان لە بەکارهێنانەکانی ئەم بنەڕەتە زمانییەدا تەنها مەبەستی هەڵگەڕانەوە نییە لە ئیسلام، یاخود هە تەنها لە شتە مەعنەوییەکان، بەڵکو مانایەکی گشتییە بۆ هەموو شتێکی مەعنەوی و هەستپێکراو، لێرەوە راغبی ئەصفەهانی لە موفرەداتەکەیدا ئاماژەی کردووە بۆ ئەم دوو ئاڕاستەیە لە بەکارهێنانی قورئانییدا:

((الرد: واتە گۆڕانی شتێك لە خودی خۆیدا: یان لە حاڵەتێك لە حاڵەتەکانیدا، ئەوترێ "رددتە فارتدّ"، خوای گەورەش دەفەرموێ (وَلاَ يُرَدُّ بَأْسُهُ عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ)، لە باسی گۆڕان لە خودیشدا دەفەرموێ: (وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ) و (ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ الْكَرَّةَ) و دەفەرموێ: (رُدُّوهَا عَلَيَّ) و

(فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ) و (يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلاَ نُكَذِّبَ)، هەروەها لە باسی گۆڕان لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکیتردا دەفەرموێ: (يَرُدُّوكُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ)، هەروەها (وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلاَ رَآدَّ لِفَضْلِهِ) واتە هیچ بەرەبست و هیچ ڕێگرێك نییە، لەسەر ئەوەش دەفەرموێ: (عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ) لەمەوە گێڕانەوە بۆ لای خوا وەکو (وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْراً مِّنْهَا مُنقَلَباً) و (ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ) و (ثُمَّ رُدُّواْ إِلَى اللّهِ مَوْلاَهُمُ الْحَقِّ) گێڕانەوەش وەکو گەڕانەوە وایە (ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ)، هەندێك دەربارەی گەڕانەوە دوو وتەیان هەیە: یەکێکیان گێڕانەوە بۆ ئەوەی کە ئامازەی پێکرا (مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ)، دووەمیان: گێڕانەوە بۆ ئەو ژیانەی کە ئامازەی پێکرا بە ئایەتی (وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى)، ئەمە هەردوو حاڵەتەکەیە کە دەکەوێتە بازنەی وشەکەوە، کە دەفەرموێ (فَرَدُّواْ أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ) واتە: پەنجەکانی خۆیان گەست، وتراویشە مانای ئەوەیە: دەستیان خستە سەر دەمیان وەك ئامازەیەك بۆ بێدەنگیی، یاخود دەستیان خستۆتە سەر دەمی پێغەمبەران و بێدەنگیان کردوون، بەکارهێنانی وشەی (رد) لێرەدا مانای ئەوەیە چەند جارێك ئەو کارەیان دووبارە کردۆتەوە، کە دەفەرموێ (لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً) واتە: بتان گێڕنەوە بۆ کاتی کافربوونتان دوای ئەوەی وازتان لێهێناوە، لە سەر ئەمەش خوای گەورە دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوَاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقاً مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ) (آل عمران: ١٠٠)، بۆیە "الارتداد والردة" واتە گەڕانەوە بەو ڕێگایەدا کە لێوەی هاتووی، بەڵام "الردة" بۆ کافربوون و هەڵگەڕانەوە بەکاردێت و "الارتداد" بۆ ئەو و بۆ جگە لەویش بەکاردێت، دەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِم) و دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ) ئەمە پاشگەزبوونەوەیە لە ئیسلام،

هەروەها (وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ) و (فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصاً) و (إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى) و دەفەرموێ: (وَنُرَدُّ عَلَى أَعْقَابِنَا) و (وَلاَ تَرْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِكُمْ)، واتە: ئەگەر خێرێکتان بە دەست هێنا، یاخود ناسیتان لێی پاشگەز مەبنەوە، هەروەها (فَلَمَّا أَن جَاء الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيراً) واتە: چاوی بۆ گەڕایەوە، دەشگوترێ حوکمەکەم گێڕایەوە بۆ ئەو واتە ئەوم کردە سەرپشك، خوای گەورەش دەفەرموێ: (وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ)، دەشفەرموێ: (فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ)، گەڕانەوەی حوشتریش هاتوچۆکردنەیەتی بۆ ئاو خواردنەوە چەند جارێك)[1].

کەواتە: هەڵگەڕانەوە لە قورئاندا واتای پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام بە ئاشکرا و وازهێنان لێی دوای چوونە ناوی دەگەیەنێ، هەموو زانایانی تەفسیر بەوە تەفسیریان کردووە کە پاشگەزبوونەوەیە لەئیسلام بەرەو کوفر، وتووشیانە ئایەتەکان مانای هەڕەشەکردنی تیایە بۆ ئەوانەی دێنە ناو ئیسلام و لێی پەشیمان دەبنەوە، یاخود کارئاسانیی دەکەن بۆ هەڵگەڕانەوە، لە هەمانکاتدا هاندانە بۆ ئەوانەی دێنە ناو ئیسلام کە دەستی پێوە بگرن و لێی هەڵنەگەڕێنەوە، چونکە ئاقڵمەندیی ڕاست و دروست لەوەدایە کە دەبێتە هۆی دامەزراندنی ژیان و بەهێزکردنی، هەروەها بەردەوامیی و ڕۆیشتن لەسەر حەق و ڕاستی کە هەرگیز شوێنکەوتوانی سەرلێشێواو نابن، بەم شێوەیە (قورتوبی) تەفسیری ئایەتی (٢١٧)ی سورەتی (البقرة)ی کردووە، هەروەها (زەمەخشەر)یش بەهەمان شێوە ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە لەم ئایەتەدا ئاگادارکردنەوەی مسوڵمانانی تیایە و هەروەها هاندانیشی تیایە بۆ

---

1. سەیری (الاصفهاني: المفردات في غريب القرآن) بکە.

بەردەوامبوون لەسەر ئیسلام تا مردن، هەریەك لە (الطبرسي) و (الآلوسي) و (النیسابوري) و (البیضاوي) هەروەها (طبري)ش لە (جامع البیان)دا هەمان شتیان وتووە.

## ئازادیی بیروباوەڕ مەبەستێکی گرنگە لە مەبەستەکانی شەریعەت

ئازادیی مرۆڤ بە یەکێك لە هەرە بەها بالاْکان و مەبەستە گرنگەکانی شەریعەت دادەنرێت، گرنگترین ڕۆڵێکە کە ئیمان و یەکخواناسی دەیبینن کاتێك مرۆڤ ڕزگار دەکەن لە بەندایەتیی بەندەکان و لە خوڕافە و بتپەرستی و دەیگەیەنن بە خوای گەورە، بە شێوەیەك کە جگە لە خوا لە کەسیتر نەترسن و پشت بە کەسیتر نەبەستن و هاوار لە کەسێکیتر نەکەن، بەڵکو بە شێوەیەکی تەواو خۆیان تەسلیمی خوا بکەن، هەروەها بۆ ئەم مەبەستەش واتە ڕزگارکردنی مرۆڤ بە تەواوی ئایەتی زۆر هاتووە کە ئەم ئازادییە پشتڕاست دەکەنەوە و داکۆکیی لێدەکەن و دەیپارێزن، بە کرۆکی مرۆڤبوونی مرۆڤی دادەنێن، بە شێوەیەك کە لەدەستی دا ئەوا ڕۆڵی خۆی وەکو مرۆڤ لە بوونەوەر و بووندا نابینێ، ئەو ئایەتانەی باس لە بەندایەتیی مرۆڤ دەکەن بۆ خوای گەورە زیاد لە دووسەد ئایەتن لە قورئاندا، کە هەموویان باسی بەندایەتیی ڕاستەقینە دەکەن و بەراوردی دەکەن بە بەندایەتی بۆ غەیری خوا، وەکو ئەوەی دووپاتی بکەنەوە کە بەندایەتیکرن بۆ خوا ڕێز و گەورەییە بۆ مرۆڤ و ڕزگارکردنیەتی نەك سەرشۆڕکردن و سووککردن، خوای بەرز و بالاْ دەفەرموێ: (وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقاً مِّنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ شَيْئاً وَلاَ

يَسْتَطِيعُونَ* فَلاَ تَضْرِبُواْ لِلّهِ الأَمْثَالَ إِنَّ اللّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ* ضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً عَبْداً مَّمْلُوكاً لاَّ يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ وَمَن رَّزَقْنَاهُ مِنَّا رِزْقاً حَسَناً فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرّاً وَجَهْراً هَلْ يَسْتَوُونَ الْحَمْدُ لِلّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ* وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لاَ يَقْدِرُ عَلَىَ شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَى مَوْلاهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لاَ يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَهُوَ عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ* وَلِلّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ إِنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ* وَاللّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئاً وَجَعَلَ لَكُمُ الْسَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) (النحل: ٧٣ – ٧٨).

كەواتە قورئان گرنگترین ئازادیی کە دەستەبەری کردبێ بۆ مرۆڤ ئازادیی بیرو ڕایە، خەڵکیش هاندەدا کە بیپارێزن، دواتر ئازادیی دەربڕین و باقی ئازادیەکانیتر کە مرۆڤبوونی مرۆڤ دەپارێزن.

ئەم ژمارە زۆرەی ئایەتانە کە هاتوونەتە خوارەوە دەربارەی گرنگیی پاراستنی ئازادییەکانی مرۆڤ، دەربارەی هیچ بابەتێکی تر بەو زۆریە نەهاتوون جگە لە بابەتەکانی وەکو: "یەکخواناسی و دەروونپاککردنەوە و بەردەوام مانەوەی مسوڵمانان" و ئەو مەبەستە شەرعییە گرنگانەی پەیوەستن پێیانەوە، وەکو: "دادگەریی و ئازادی و یەکسانیی"، بۆیە قورئان ئەم ژمارە زۆرەی لەو ئایەتانە لەخۆ گرتووە تا جەخت بکاتەوە لەسەر ئەوەی کە ئینسان ئازاد و سەربەستە لەوەی چی بیرو باوەڕێك هەڵدەگرێ، بۆ هیچ کەسێکیش نییە زۆری لێبکات تا لەسەر ئەو بیرو باوەڕەی نەمێنێ، یان بچێتە سەر بیرو باوەڕێکیتر، بۆ ئەوەی دووپاتی ئەوە بکاتەوە کە عەقیدە کارێکی تایبەتی نێوان مرۆڤ و خوایە و هیچ کەسێك بۆ نییە کە زۆری لێبکات لە ژێر هەفشارێکدا بێ.

ئـازادیی بـیرو بـاوەڕ زۆرێـك لـە گرنگیـی قورئـانی داگـیر كـردووە و وەكـو پەیوەندیەكی تایبەتی نێوان مـرۆڤ و خـوای خـۆی دیـاری كـردووە، زۆر ئایـەت یەكدەگرنـەوە لەسـەر زەروورەتـی پاراسـتنی ئـەم مافـە لەهـەر كارتێكـەرێكی دەرەكیی، لە پێشەوەی هەموو ئایەتەكاندا ئەم ئایەتەیـە: (لاَ إِكْـرَاهَ فِـي الـدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَـدِ اسْتَمْـسَكَ بِـالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (البقـرة: ٢٥٦)، سـەید ڕەشـید ڕەزا لـە تەفسیری (مەنار)دا باسی هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە دەكات كە یارمەتیدەرە بۆ تەفسیركردنی بە شێوەیەك كـە هـیچ بوارێـك ناهێڵێتـەوە بـۆ ئـەو قـسانەی كـە دەڵێن نەسخ بۆتەوە یان تەفسیریان كردووە بەو شێوەیەی كە ناگونجێ لەگەڵ گشتێتیی ئایەتەكەدا، ئەو دەڵێ دەربارەی هۆی هاتنەخوارەوەی (ئـەبوداوود و نەسائی و ئیبنو حیبان و ئیبنـو جـەریر لـە ئیبنـو عەبباسـەوە دەگێڕنـەوە كـە وتوویەتی: كاتێك ئافرەتێك منالّی بۆ نەدەما، واتە كە لەدایك دەبوون دەمردن، ئەویش لەسەر خۆی نەزر دەكرد كە ئەگەر یەكێك لە منالّەكانی نەمرد و مایەوە بیكات بە جوولەكە، كاتێك بەنو نەزیر دەركران لە مەدینە كۆمـەڵێك منـالّی لـەو بابەتـەیان لابـوو كـە هـی ئەنـصارەكانی مەدینـە بـوون، وتیـان ئێمـە واز لـە منالّەكانی خۆمان ناهێنیین بڕۆن لە گەڵیانـدا، ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە: (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ)، هەروەها ئیبنو جەریر لە ڕێگای عیكریمەوە ئەویش لـە ئیبنـو عەبباسەوە دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر پیاوێك هاتە خوارەوە لە ئەنصار كـە لـە بەنو سالم بوو پێیـان دەوت حـصین، دوو منـالّی هـەبوو كـە نەصـرانی بـوون و ئەویش خۆی مسوڵمان بوو، بە پێغەمبەری خوایﷺ وت: ئایا زۆریـان لێبكـەم لە كاتێكدا ئەوان هەر دەیانەوێ بە نەصـرانیەتی بمێننـەوە؟ ئـەم ئایـەت هاتـە خوارەوە، لـە هەنـدێ تەفـسیردا هـاتووە كـە ئـەو پیـاوە ویـستوویەتی زۆریـان

لێبکات و ئەوانیش ڕازی نەبوون، بۆیە هاتوون بۆ لای پێغەمبەرﷺ و کابرا وتوویەتی ئەی پێغەمبەری خوا ئایا بەشێك لە لاشەم بچێتە ئاگرەوە و منیش سەیر بکەم ـ واتە دوو منداڵەکەی ـ، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ ڕێگای نەداوە زۆریان لێبکات بۆ ناو ئیسلام، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی زۆری هەیە دەربارەی ئەو ژنانەی کە نەزریان کردووە منداڵەکانیان بکەن بە جوولەکە بۆ ئەوەی بمێنن لە ژیاندا، وە مسوڵمانان دوای مسوڵمانبوونیان ویستوویانە بە زۆر بیانگێڕنەوە ناو ئیسلام بۆیە ئەم ئایەتە دابەزیوە و لە یەکی جیاکردوونەتەوە. لە یەکێك لە ڕیوایەتەکانیدا کە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە گێڕاویەتیەوە دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (قد خيّر الله أصحابكم فإن اختاروكم فهم منكم وإن اختاروهم فهم منهم) واتە: خوای گەورە کەس و کاری ئێوەی سەرپشك کردووە، ئەگەر ئێوەیان هەڵبژارد ئەوا لە ئێوەن، خۆ ئەگەر ئەوانیشیان هەڵبژارد ئەوا لەوانن.

لە تەفسیرەکەدا (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: ئائەوەیە حوکمی ئایین کە زۆرێك لە دوژمنانی دەڵێن بە شمشێر و هێز هاتووە و بە هێز خراوەتە بەردەم خەڵکی، جا ئەوەی وەریگرتووە ڕزگاری بووە و ئەوەشی ڕەتی کردۆتەوە بە شمشێر حوکمی کراوە، کاتێك پێغەمبەرﷺ لە مەککەدا بە دزیەوە نوێژی دەکرد، ئایا شمشێر کاری دەکرد؟ یان کاتێك موشریکەکان مسوڵمانانیان بە جۆرەها شێوەی سزا تاقی دەکردەوە تا پێغەمبەرﷺ ناچار بوو کۆچ بکات، شمشێر حوکمی دەکرد؟ یاخود دەڵێن ئەم زۆریکردنە لە مەدینەدا بوو دوای ئەوەی ئیسلام بەهێز بوو، ئەم ئایەتە لەوپەڕی بەهێزیدا هاتۆتە خوارەوە، چونکە غەزای بەنو نەزیر لە ڕەبیعولئەووەلی ساڵی چوارەمدا بوو، بوخاری دەڵێ لە پێش غەزای ئوحوددا بووە کە خیلاف نییە لەسەر

ئەوەی کە لە شەووالی ساڵی سێیەمدا بووە، بێباوەڕەکان ئەوکاتە بەردەوام خەریکی هێرشکردن بوون بۆ سەر مسوڵمانان، بەنو نەزیر پەیمانەکەیان لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ هەڵوەشاندەوە و کەوتنە فێڵکردن لێی و ویستیان پەنهانکوژی بکەن و دووجار بۆ ئەم مەبەستە هەوڵیاندا لە کاتێکدا کە لە پاڵ ئەودا نیشتەجێ بووبوون لە دەوروبەری مەدینەدا، بۆیە چارنەما جگە لە دەرکردنیان لە مەدینە، بۆیە دەوریان گرتن و دەریانکردن، وە پێغەمبەرﷺ ڕێگای بە هیچ کەسێك نەدا کە منداڵەکەی بە زۆر پەلکێش بکات بۆ ناو ئیسلام و ئەوەی کە ویستی ڕۆیشت لەگەڵیاندا، شێخ موحەممەد عەبدە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرموێ لەناو هەندێ لە گەلاندا بە تایبەتی لەناو نەصرانیەکاندا ئەوکاتە باوبوو کە بەزۆری زۆرداریی خەڵکیان دەخستە سەر ئایینی خۆیان، ئەم مەسەلەیەش زیاتر بە سیاسەتەوە بەند بوو تا بە دینەوە، چونکە ئیمان ـ کە کرۆك و ئەسڵی ئایینە ـ بریتییە لە جێگیربوون لە نەفسدا، بۆیە ئەو جێگیربوونە هەرگیز بەزۆر نابێ، بەڵکو دەبێ بە ئاشکراو بە بەڵگە و ڕوونکردنەوە بێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: (قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ) واتە دەرکەوتووە کە لەم ئایینەدا ئاقڵمەندیی و هیدایەت و سەرفرازیی و ڕووناکی ئایندە هەیە، هەرکەسێك پێچەوانەی بێت لە گەلان و نەتەوەکان ئەوا لە سەرلێشێواوی و ڕێ لێتێکچووندایە)[1]، قورئان لێپرسینەوەی تایبەت کردووە بە خوای پەروەردگار خۆیەوە لەو کەسانەی کە جگە لەو کەسیتر دەپەرستن و هاوبەش دادەنێن: (وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ) (المؤمنون: ١١٧)، هەروەها ڕووی قسە دەکاتە پێغەمبەرﷺ و پێی دەفەرموێ (لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ) (الغاشية: ٢٢)،

---

1. سەیری تەفسیری (المنار)ی موحەممەد رەشید ڕەزا بکە ٣٦/٣ -٣٧.

(وَمَـا أَنـتَ عَلَـيْهِم بِجَبَّـارٍ فَـذَكِّرْ بِـالْقُرْآنِ مَـن يَخَـافُ وَعِيـدِ) (ق: ٤٥)، هـەروەها دەفـەرموێ: (فَإِنَّمَـا عَلَيْـكَ الْـبَلاَغُ وَعَلَيْنَـا الْحِسَابُ) (الرعـد: ٤٠)، هـەروەکو زۆر ئایەتی تر هەن کە ڕوونی دەکەنەوە بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە بـەکارهێنانی ڕێگای زۆریکردن هیچ سوودێکی نییە، چونکە ئەگـەر خـوا بیزانیایـە زۆریکـردن هیچ سوودێکی دەبێـت ئـەوا فـەرمانی دەکـرد بـە پێغەمبەرەکـەی کـە بـەکاری بهێنێ، وەك دەفەرموێ: (وَلَوْ شَاء اللّهُ مَا أَشْرَكُواْ وَمَا جَعَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظاً وَمَا أَنـتَ عَلَـيْهِم بِوَكِيـلٍ) (الأنعـام: ١٠٧) دەشـفەرموێ (أَفَأَنـتَ تُكْـرِهُ النَّـاسَ حَتَّـى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ) (يونس: ٩٩) هەروەها خوای گەورە ئەوەشـی ڕوون کردۆتـەوە کـە عەقیـدە و بـیرو بـاوەڕ ملکەچـی زۆریکـردن نابـێ بـە هـەر شـێوەیەك بێـت هەتاوەکو مەبەستیش لێی ڕزگارکردن و پەرۆشی کەسی بانگکراو بێـت، خـوای گەورە دەفەرموێ: (وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ) (يوسف: ١٠٣)، بۆیە خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ هانداوە بۆ ئەوەی خەڵکی بانگ بکات بۆ ئـایین و ئیمـان و وازهێنـان لـە کـوفر و بێبڕوایـی بـە قـسەی بـە پێـز و بەڵگـە و بـە حیکمەتەوە، خـوای بـالا دەفـەرموێ (ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ) (النحل: ١٢٥).

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئـازادیی بـیرو بـاوەڕ لـە قورئانـدا بـە هـەموو شێوەیەك پارێزراوەو وای لێهاتووە بووە بە ئازادییەکی ڕەها و هیچ سنوورێکی نییـە مـادام لـە چوارچـێوەی ئـازادیی هەڵبـژاردنی بیروبـاوەڕدا بێـت، مـافی لێپرسینەوەشی تەنها تایبەتە بە خـوای گـەورەوە و ئیـشی هـیچ کەسـێکی تـر نییە.

هەندێك جیاوازی دەكەن لـە نێـوان ئـازادیی كەسـێكی بێبـاوەڕ كـە هـەر لـە ئەسڵدا ئیمانی نەهێناوە و لە نێوان ئەو كەسەی كە بووە بە مسوڵمان و دوایـی هەڵگەڕاوەتـەوە، دان دەنـێن بـە هـەموو مافێـك بـۆ كەسـی یەكـەم و هـەموو مافێكیش لە كەسی دووەم زەوت دەكەن، خـوای گـەورەش دەفـەرموێ: (وَمَـن يَتَبَـدَّلِ الْكُفْـرَ بِالإِيمَـانِ فَقَـدْ ضَـلَّ سَـوَاء الـسَّبِيلِ) (البقـرة: ١٠٨)، هــەروەها دەفەرموێ: (وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَـانِكُمْ كُفَّـاراً حَـسَداً مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ فَاعْفُواْ وَاصْفَحُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَـدِيرٌ) (البقـرة: ١٠٩)، هـەروەها دەفـەرموێ: (وَلاَ يَزَالُـونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىَ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُواْ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُـتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَـئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِـرَةِ وَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّـارِ هُـمْ فِيهَا خَالِدُونَ) (البقـرة: ٢١٧)، خـوای كاربـەجێ دەفـەرموێ: (كَيْـفَ يَهْـدِي اللّـهُ قَوْماً كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُواْ أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَـاءهُمُ الْبَيِّنَـاتُ وَاللّـهُ لاَ يَهْـدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ* أُوْلَـئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللّهِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالنَّـاسِ أَجْمَعِـينَ* خَالِدِينَ فِيهَا لاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلاَ هُمْ يُنظَرُونَ* إِلاَّ الَّذِينَ تَـابُواْ مِـن بَعْـدِ ذَلِـكَ وَأَصْلَحُواْ فَإِنَّ الله غَفُورٌ رَّحِيمٌ* إِنَّ الَّذِينَ كَفَـرُواْ بَعْـدَ إِيمَـانِهِمْ ثُـمَّ ازْدَادُواْ كُفْـراً لَّـن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الضَّآلُّونَ) (آل عمران: ٨٦ – ٩٠)، ئەمانە و زۆرێكی تـر لەو ئایەتانەی باسكران لە پێشەوە.

هــەموو ئــەم ئایەتانــە و غــەیری ئەمانــەش ئــەوە دووپـات دەكەنــەوە كــە هەڵگــەڕاوە ســزای دواڕۆژی هەیــە بــێ هــیچ ســزایەكی دنیــایی لەســەر هەڵگەڕانەوەكـەی، ئـەم ئایەتـە لـە هـەموو ئایەتـەكان ڕاشكاوانەتر باسـی ئـەو مەسەلەیەی كردووە: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ آمَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ازْدَادُواْ كُفْراً لَّمْ يَكُنِ اللّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلاَ لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلاً) (النساء: ١٣٧)، هـەموو ئـەم ئایەتانـە

به ڕاشکاوی باسی هەڵگەڕانەوە دەکەن و هیچیان بۆ تەنها جارێکیش باسی سزای هەڵگەڕانەوەیان نەکردووە لە دنیادا، نە لە سێدارەدان و نەهیچ شتێکیتر، چونکە سەروەریی قورئان سەروەریی ئاسانکاری و ڕەحمەتە، سەروەریی داننانە بە ئازادیی بیروباوەڕ و پاراستنی ئەو ئازادیە، دووپاتیشی دەکاتەوە کە بڕوابوون و کافربوون کاری دڵە و لە نێوان بەندە و خوادایە، سزای هەڵگەڕانەوە لە ئیمان دوای بڕواپێهێنانی سزایەکە پەیوەندی بە دواڕۆژەوە هەیە و هەر خوا خۆی خاوەنی یەکەم ماف و کۆتا مافە.

سەرەڕای ئەوەی کە قورئان بە ئایەتە پیرۆزەکانی خراپی و ترسناکیی ئەم تاوانەی ڕوونکردۆتەوە، هەروەها دەری خستووە کە هەر کەسێك تێی بکەوێ کەوتۆتە ناو کوفرەوە، بەڵام سزایەکی لە دنیادا بۆ دیاریی نەکردووە (وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّاً).

# سوننەتی پێغەمبەر و کوشتنی هەڵگەڕاوە

## پێشەکی

پـێش ئـەوەی باسـی فـەرموودەکان بکـەین دەربـارەی ئـەم مەسـەلەیە، دەمانەوێ باسی زەروورەتێکی ئـایینی و بەڵگەنەویـستێکی ئیـسلامیی بکـەین، ئەویش ئەوەیە قورئـان و سـوننەت نیگـان لـەلای پـەروەردگارەوە بـە گشتی، ئەگەرچی جیاوازی زۆرە لە نێوان قورئان و سـوننەتدا لـە ڕووی چۆنیەتیەوە، قورئـانی پـیرۆز سەرچـاوەی دامەزرێنـەری حوکمەکانـە، فـەرموودەی پـیرۆز و ڕاستی پێغەمبەرﷺ ڕوونکەرەوەی ئەو شتانەن کە لە قورئاندا هاتوونو دەبـی پەیڕەو بکرێن، هـەردووکیان بەڵگـەی بەهێزکـەری یـەکترین و نـاکرێ شـتێکیان تیابێ پێچەوانەی یەکتری بێت، یاخود ڕەتی ئەویتر بکاتـەوە و جیـاوازی هـەبێ لە نێوانیاندا، یاخود نەسخ و هەڵوەشاندنەوەی حکومـەکانیان تیابـێ، چـونکە نەسخ و هەڵوەشاندنەوەی حکومەکان ڕوونکردنەوە نییە، بەڵکو لابردنە.

بۆیــە نــاکرێ و نابــێ لــە ڕووی شــەرعیو ئەقڵیــشەوە لــە ســوننەتی پێغەمبەرداﷺ شتێك هەبێ دژی بنچینەکانی قورئان بێت، بـە هـیچ جۆرێـك لـە جۆرەکان، چ جای ئـەوەی هـەڵی بوەشـێنێتەوە، بۆیـە ئـەوەی قورئـان باسـی دەکــات فــەرموودە ڕوونــی دەکاتــەوە، ئەگــەر خــەڵکیی پێویــستیان بــە ڕوونکردنەوە هەبوو، جا بە قسە لـە لایـەن پێغەمبـەرەوەﷺ یـاخود بـە کـردار بێت یان تەنها بە دانپیانان بێـت بـە قـسە و کـرداری خـەڵکی تـر، بۆیـە لەگـەڵ قورئان یەکتری بەهێز دەکەن، هەر شتێکیش کە لە فەرموودەدا هاتبێ ناکرێ و نابێ تەنها لە بواری ڕوونکردنەودا نـەبێ بـۆ قورئـان، چـۆن وانییـە لـە کاتێکـدا

دەزانین کاری پێغەمبەرﷺ ڕاگەیاندنی قورئان بووە بەو شێوەیەی کە خوای گەورە دیاریی کردووە، هەروەها خوێندنەوەی بە سەر خەڵکیدا و فێرکردنیان و پاککردنەوەیان پێی.

باشە کاتێك قورئان بە ڕەهایی سنوورەکانی ئازادیی بیروڕای دیاریی کردبێ و بە هەموو شێوەیەك پاراستبێتی، هەروەها سزای هەڵگەڕاوە و کافرەکانی دانابێ بۆ ڕۆژی دوایی و تایبەتی کردبێت بە خوای گەورەوە، دەکرێ چاوەڕوانی ئەوە بین کە سوننەتی پێغەمبەرﷺ دژی بێت و شتێك بڵێ جیا لەو؟ بە تایبەتی کاتێك ئەم مەسەلەیە لە تەنها ئایەتێك و دوو ئایەتدا نەهاتبێ بەڵکو لە زیاد لە دووسەد ئایەتدا هاتبێ کە هەموویان یەکتری پتەو و بەهێز دەکەن کە پاراستنی ئازادیی ڕادەربڕینە.

سەردەمی پێغەمبەرﷺ سەدان کەسی تیابووە کە بڕوایان هێناوەو دواتر بوون بە دەغەڵ و هەڵگەڕاوە، نەك هەر ئەوە، بەڵکو کار گەیشتۆتە ئەوەی کە ئازاری پێغەمبەریانﷺ داوە و فێڵ و تەڵەکەیان دەرهەق کردووە، ئەو دەسەڵاتەی لە مەدینەدا هاتە کایەوە بۆ نەهێشتنی ئازاری ئەوان بوو پێغەمبەریشﷺ دەستی بۆ نەبردن تا "نەڵێن موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێ"، یاخود بە زۆر بیرو باوەڕی خۆی بە سەر خەڵکیدا دەسەپێنێ، لەوانە ئەوەی دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول گێڕدراوەتەوە، عەبدوڵڵای کوڕی کە لە هاوەڵە دیارەکانی پێغەمبەرﷺ بوو شەڕی بەدر و ئوحودی بینی بوو لە هەموو ڕووداوەکاندا لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ دابوو، خەزرەج پێش ئیسلام کۆبوونەوە بۆ ئەوەی باوکی بکەن بە پێشەواو سەرگەورەی خۆیان، بەڵام کاتێك پێغەمبەرﷺ هاتە مەدینە بڕیارەکەیان گۆڕی، ئەویش ڕژدی بە پێغەمبەرﷺ دەبرد و خۆی بە گەورە دەزانی، دووڵی

و دەغەڵیی خۆی شاردەوە، هەر ئەو بوو کاتێك مسوڵمانان لە غەزای بەنو موستەلەق گەڕانەوە وتی: (لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ)، عەبدوڵڵای کوڕیشی بە پێغەمبەریﷺ وت: سوێند بە خوا ئەو خۆی سەرشۆڕ و کەمە، تۆ بەڕێز و گەورەیت ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر تۆ ڕێگام پێ بدەی بیکوژم ئەوا دەیکوژم، سوێند بە خوا لەگەڵ ئەوەشدا هەموو خەزرەج دەزانێ کە پێش ئیسلام کەسێك نەبووە لەمن باشتر و چاکەخوازتر بووبێت بۆ باوکی خۆی، بەڵام دەترسم کە فەرمان بدەی بە مسوڵمانێکی تر بیکوژێت و دوایی نەفسم ڕێگام نەدا سەیری بکوژی باوکم بکەم بە زیندوویی بە ڕێگادا بڕوات تا دەیکوژم، ئەوکاتەش مسوڵمانێك لە جیاتی کافرێك دەکوژم و دەچمە دۆزەخەوە، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: "بەڵام ئێمە هاوڕێیەتی دەکەین بە چاکە و لەگەڵیشیدا نەرم و نیان دەبین تا ئەو هاوەڵمان بێت، خەڵکیش نالێن موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێ، بەڵکو بڕۆ چاکەی لەگەڵدا بکە و یارمەتی باشەی بدە"، کاتێك مرد عەبدوڵڵا داوای لە پێغەمبەرﷺ کرد نوێژی لەسەر بکات، ئەم ئایەتە دابەزی (وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَداً وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ).

## ڕووداوی یەکەم: هەڵگەڕاوەکانی دوای ئیسرا و میعراج

کێشە و بەرەیەکی زۆر هەیە لە نێوان مێژوونووس و نووسەرانی سیرەدا دەربارەی مێژووی ڕوودانی ئیسراو میعراج، بە شێوەیەك کە هەندێکیان دەڵێن لە ساڵی خەم (عام الحزن)دا بووە، کە تیایدا ئەبو تالیب و خەدیجە وەفاتیان کرد کە ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتی بوو.

**هەندێکیتر دەڵێن ساڵێك پێش کۆچ ڕوویداوە[1]، بە هەرحاڵ لەسەر ئەوە ناکۆکیی نییە کە لە دوای ڕوودانی ئیسرا و میعراج کۆمەڵێك لە دین هەڵگەڕانەوە کە پێشتر مسوڵمان بوون، لەوانەی ئەمەیان باسکردووە ئیبنو هیشام لە سیرەکەیدا کە لە ئیبنو ئیسحاقەوە دەربارەی ئیسرا باسی کردووە، دەڵێ: "زۆربەی خەڵکی وتیان: سوێند بە خوا ئەمە شتێکی ئاشکرا و دیارە، کاتێك کاروان لە مەککە دەردەچێ بەرەو شام، مانگێکی پێدەچێ و کاتێك دەگەڕێتەوە مانگێکی تر، باشە موحەممەد ئەمەی چۆن بە شەوێك بڕی و گەڕاشەوە بۆ مەککە؟ وتی: زۆرێك لەوانەی مسوڵمان بووبوون پاشگەز بوونەوە..."[2] بەڵام ناوی هیچ کەسێکیان لەو هەڵگەڕاوانە نەبردووە.**

**حاکم لە موستەدرەکدا لە عائیشەوە ﵂ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: "ئەوکاتەی شەوڕەویی بە پێغەمبەر ﷺ کرا بۆ مزگەوتی ئەقصا، خەڵکی باسیان دەکرد، کۆمەڵە خەڵکێکیش لەوانەی کە پێشتر بڕوایان پێ هێنابوو هەڵگەڕانەوە، هەر بۆ ئەوەش هاتن بۆ لای ئەبوبەکر....".**

**ئیمام ئەحمەد لە موسنەددا و نەسائی لە (السنن الكبرى)دا لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: "شەوڕەویی کرا بە پێغەمبەر ﷺ بۆ بەیتولمەقدیس، دوایی هەر ئەو شەوە هاتەوە و باسی ڕۆیشتنەکەی و نیشانەی بەیتولمەقدیس و کاروانەکەیانی کرد، کۆمەڵێك وتیان ئێمە بڕوا بە موحەممەد**

---

[1]. بەیهەقی لە زوهریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێش چوونی بۆ مەدینە بە ساڵێك شەوڕەوی پێکراوە، حاکم لە مێژووی فەرزبوونی نوێژدا دەڵێ لە شەوی ئیسرادابوو بە دوانزە مانگ پێش کۆچکردن، هەروەکو لە بیدایە و نیهایەدا هاتووە، زەمەخشەریش ئەو ناکۆکیە زۆرەی هێناوە لە کەششافدا دەربارەی کاتی ئیسرا و میعراج و قسەیەکی غەریبیشی هێناوە کە دەڵێ پێش پێغەمبەرایەتی بووە.

[2]. السيرة النبوية، أبو محمد عبدالملك بن هشام الحميري.

ناکەین بەوەی کەدەیڵێ، بۆیە هەڵگەڕانەوە و کافربوون، خوای گەورەش لە ملیانی دا لەگەڵ ئەبو جەهلدا..."[1].

ئەوەی تێبینی دەکرێ لەم گێڕانەوانە ئەوەیە کە ئاماژە دەکەن بە هەڵگەڕانەوەی کۆمەڵێك کە پێشتر بڕوادار بوون بە پێغەمبەرﷺ و پەیامەکەی، بەڵام ژمارەیان نەوتراوە، کەسیش ناوی نەبردوون، بەڵکو قسەکە بە گشتی وتراوە، موفەسیرەکانیش ناوی کەسیان نەهێناوە لەم بابەتەدا، بە تایبەت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: (وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِالنَّاسِ وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلاَّ فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي القُرْآنِ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلاَّ طُغْيَاناً كَبِيراً) (الإسراء: ٦٠)، مەبەست لەمەش ئەوەیە کە تەبەری وتوویەتی: کە لە قەتادەوە گێڕاویەتیەوە: (وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلاَّ فِتْنَةً لِّلنَّاسِ)، ئەو دەڵێ: خوای گەورە نیشانە و بەڵگەکانی لە ڕێگادا نیشاندا کە دەچوو بۆ بەیتولمەقدیس، بیستمان کە خەڵکانێك هەڵگەڕانەوە کە پێغەمبەرﷺ ئەم بابەتەی باسکرد بۆیان، بەدرۆیان زانی و سەریان سوڕما، وتیان تۆ باسی ڕێگای دوومانگ دەکەی کە لە تەنها شەوێکدا بڕیوتە؟، تەبەری قسەکانی بەوە کۆتایی دەهێنێ لە تەئویلی ئەم ئایەتەدا: (وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلاَّ فِتْنَةً لِّلنَّاسِ)، دەڵێ: تاقیکردنەوەی ئەوانەی کە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام بە بیستنی ئەم خەوە کە پێغەمبەرﷺ بینیویەتی، بۆ موشریکەکانی مەککەش زیادبوونی کەللەڕەقی و سەرلێشێواویان بە بیستنی ئەم مەسەلەیە، هەموو ئەمانەش هەواڵی تەنها کەسن (آحاد) لە ڕووداوێکی گرنگ و ترسناکی وەکو ئەم مەسەلەیە کە دەبوایە خەڵکانێکی زۆر بیگێڕنەوە.

---

[1]. تفسير القران العظيم، أبن كثير القرشي الدمشقي، ٢٨/٥، وتووشیەتی ئیسنادەکەی صەحیحە.

## ڕووداوی دووەم: باسی ئەوانەی کە دوای کۆچکردن بۆ حەبەشە هەڵگەڕانەوە

- **عوبەیدوڵڵای کوڕی جەحش (أبو جحش):**

لە سیرەی ئیبنو هیشامدا هاتووە: (ئیبنو ئیسحاق وتوویەتی:.. بەڵام عوبەیدوڵڵای کوڕی جەحش، مایەوە تا مسوڵمان بوو، دوایی کۆچی کرد بۆ حەبەشە، خێزانەکەشی کە ئوم حەبیبەی کچی ئەبوو سوفیان بوو لەگەڵیدا بوو مسوڵمان بوو، بەڵام کاتێك گەیشتە حەبەشە، لەوێ بوو بە نەصرانی و هەر لەسەری مایەوە تا تیاچوو،.... وتی: کاتێك عوبەیدوڵڵا بەلای هاوەڵانی پێغەمبەرﷺدا تێدەپەڕی کە لە حەبەشە بوون دەیووت: ئێمە چاومان کرایەوە و ئێوە هێشتا هەر خەریکی چاوتروکاندنن).

ئەوانەی دەربارەی ژیان و مردنی هاوەڵان شتیان نووسیوە، هەواڵی هەڵگەڕانەوەی عوبەیدوڵڵایان لە حەبەشە داوە دوای ئەوەی کە مسوڵمان بووبوو[1].

---

[1]. هەموو مێژوونووسان کۆکن لەسەر هەڵگەڕانەوەی ئەم کابرایە و هیچ کامیان لە ناو هاوەڵاندا باسیان نەکردووە، بەڵکو لە باسی ژیاننامەی ژنەکەیدا کە ئوم حەبیبە بووە باسی ئەمیشیان کردووە، بەڵام ئەوەی کە مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە ئەم کابرایە یەکێك بووە لەو چوار کەسەی کە لە جاهیلیدا بتپەرستییان ڕەتکردۆتەوە، لەوانەبووە کە بە دوای دینی هەقدا گەڕاون، کە دینی ئیبراهیم (علیه السلام) بووە، لەمەوە ئیبنو هیشام دەڵێ: قورەیش ڕۆژێك کۆبوونەوە لە لای یەکێك لە بتەکانیان کە بە گەورەیان دەزانی و لە ساڵدا ڕۆژێکیان تەرخان کردبوو بۆی و وەکو جەژنیان لێکردبوو، حەیوانیان بۆ سەردەبڕی و لەلای دەمانەوە، چوار کەس لەوان جیابوونەوە و وتیان بزانن کە هۆزەکەمان لەسەر هیچ ئایینێك نین و ئەوەی کە دەیکەن هیچ نییە، بەڵام با ئەمە شاراوە بێت لە نێوانماندا، ئەوانیش وەرەقەی کوڕی نەوفەل و عوبەیدوڵڵا و عوسمانی کوڕی حوەیریس و زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەوفەل بوون، وتیان بەردێك چییە بە دەوریدا بسووڕێینەوە و بیپەرستین کە نەدەبینێ و نە دەبیستێ و هیچ زیان قازانجی بە دەست نییە، بەڕاستی هۆزەکەمان ئایینی باپیرە ئیبراهیمیان لە بیر کردووە و ڕۆیشتن هەریەکەیان لە شوێنێك چوونە سەر ئاینی ئیبراهیم کە حەنیفی بوو.

- **سەكرانی كوڕی عومەر**

بەلازەری لە ئەنسابی ئەشرافدا دەڵـێ: (سـەكرانی كـوڕی عومـەر، چـوو بـۆ حەبەشە لە دووەم جاردا، ژنەكەشی كـە سـەودەی كـچی زەمعـە بـوو لەگەڵـیدا بوو، دەڵێن هەردوو جارەكە كۆچی كردووە بۆ حەبەشە، دوایی گەڕاوەتەوە بـۆ مەككە و پـێش كۆچـی مەدینـە مـردووە، پێغەمبـەرﷺ بـە خـاكی سـپاردووە، دوایی ئاگاداریی منداڵ و ژنەكەی بـۆ كـردووە، هەنـدێكیش دەڵـێن لـە حەبەشـە مردووە بە مسوڵمانی، هەندێكیش دەڵێن هاتۆتەوە بۆ مەككە و دوایی چـۆتەوە بۆ حەبەشە و لەوێ بە هەڵگەڕاوەیی یان بە نەصرانێتی مردووە).

## رووداوی سێیەم: هەڵگەڕانەوەی نووسەری وەحی

- **نووسەری بەنو نەججار**

بوخاری لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (پیاوێك نەصرانی بوو مسوڵمان بـوو سـوڕەتی ئەلبەقـەرە و ئـالی عیمرانـی خوێنـد، وەحـی دەنووسـیەوە بـۆ پێغەمبەرﷺ، دوایی بووەوە بە نەصرانی، دەیوت موحەممەد هیچ نازانێ تەنها ئەوە نەبێ كە من بۆم نووسیوە، دوایی مرد و بە خاكیـان سـپارد، بـەڵام زەوی فڕێیدایەوە دەرەوە، وتیـان ئەمـە كـاری موحەممـەد و هاوڕێكانیـەتی، دەریـان هێناوەتەوە و فڕێیان داوە، هـاتن چـاڵێكی قووڵتریـان بـۆ هەڵكەنـد، خـستیانە نـاوی بــە هەمانــشێوە زەوی فڕێیدایــەوە، وتیــان هەمدیــسان موحەممــەد و هاوڕێكانی دەریان هێنایەوە چونكە ڕایكردووە لە دەسـتیان، بۆیـە تـا توانیـان چاڵێكی قووڵتریان هەڵكەند، خستیانە ناوی بەڵام هەر زەوی لە خـۆی نـەگرت و فڕێیدایــەوە، بۆیــە زانیــان كــە ئەمــە كــاری ئــەوان نییــە و وازیــان لێهێنــا و تەرمەكــەیان فڕێـدا) (بوخــاری ڕیوایــەتی كــردووە لــە بەشــی نیــشانەكانی

پێغەمبەرایەتیدا)، بەڵام موسلیم ئەمەی لێزیاد کردووە و دەڵێ: (پیاوێك لە ئێمە بەنو نەججارِ هەبوو ئەلبەقەرە و ئالی عیمرانی خوێندبوو بۆ پێغەمبەری خوایﷺ دەنووسی، بەڵام ڕۆژێك ڕایکرد و چووە ناو ئەهلی کیتابەوە، ئەوانیش بەرزیان کردەوە لای خۆیان چونکە کاتی خۆی لای پێغەمبەرﷺ وەحی نووسیووە، زۆر پێوە سەرسام بوون، بەڵام خوای گەورە زۆری پێنەچوو لە ناوی برد....).

- **عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی سەرحی قوڕەشی عامری**

ئەبوداود لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (عەبدوڵڵای کوڕی سەرح وەحی دەنووسیەوە، شەیتان چووە بن کلێشەیەوە و لەباری برد و پەیوەندی کرد بە کافرەکانەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمانیدا کە ڕۆژی فەتحی مەککە بکوژرێ، بەڵام عوسمانی کوڕی عەففان داوای پەنادانی بۆ کردو ئەویش پەنایدا).

بەلازەری دەڵێ: (بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح، ئەوا مسوڵمان بوو وەحی دەنووسیەوە لەبەر دەستی پێغەمبەرﷺ دا، کە پێی دەفەرموو بنووسە (الكافرين) دەینووسی (الظالمين)، کە دەیفەرموو بنووسە (عزيز حكيم) دەینووسی (عليم حكيم) و شتی لەو جۆرە، دوایی دەیوت ئەوەتا منیش وەکو موحەممەد دەنووسم و چی بۆ ئەو دێتە خوارەوە بۆ منیش دێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: (وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللّهِ كَذِباً أَوْ قَالَ أُوْحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنَزلَ اللّهُ) (الأنعام: ٩٣)، بۆیە ڕایکرد بۆ مەککە بە هەڵگەڕاوەیی، پێغەمبەریشﷺ فەرمانی کوشتنی دەرکرد، ئەم کەسە برای شیریی عوسمانی کوڕی عەففان بوو، داوایەکی زۆری لە پێغەمبەرﷺ کرد تا لێی خۆش بوو)، ئەم هەواڵە

هەرچەندە جیاوازە لەوەی کە باو بووە، چونکە خوێندنەوە و نووسینەوەی تێکەڵ کردووە بۆ ئایەتەکان، لەوانەیە هەر مەبەستی نووسینەوە بێت، بەڵام ئایا ئەوەی کە دەینووسیەوە دەیخستە بەرچاوی هیچ کەسێك؟ یان کەس هەستی پێکردووە تا خۆی ڕای نەگەیاندووە؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەواڵە ئەوە دەگەیەنێ کە هەڵگەڕانەوە سزای دنیایی نییە، ئەگەرنا پێغەمبەری خواﷺ تکای عوسمانی قبوڵ نەدەکرد، هەر ئەوەشی بەو دەوت کە بە ئوسامەی وت دەربارەی ئەو ئافرەتە مەخزومیەی دزی کردبوو هاتبوو شەفاعەتی بۆ بکات، (ئایا تکا بۆ کەسێك دەکەی لە سنوورێك لە سنوورەکانی خوادا).

## ڕووداوی چوارەم: ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ خوێنی حەڵاڵ کردبوون بە هۆی ئازاردان یان تاوانیان لە پاڵ هەڵگەڕانەوەکەیاندا

کاتێك پێغەمبەری خواﷺ فەتحی مەککەی کرد لە ساڵی هەشتی کۆچیدا، بە ئەمیرەکانی سوپای ڕاگەیاندبوو کە کەس نەکوژن مەگەر یەکێك شەڕیان لەگەڵدا بکات، دەیویست مەککە بە ئاشتی فەتح بکرێت، بەڵام کۆمەڵە کەسێکی دیاریی کرد و ناوی بردن کە ئەگەر لە ژێر پەردەی کەعبەشدا بن دەبێ بکوژرێن، ئەوانەش شەش پیاو و چوار ژن بوون: عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، هوباری کوڕی ئەسوەد، عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح، میقیسی کوڕی صەبابە، حوەیریسی کوڕی نوقەیز، عەبدوڵڵای کوڕی هیلال، هیندی کچی عوتبە، سارەی کەنیزەکی عەمری کوڕی هیشام، هەردوو

سەماکەرەکەی عەبدوڵڵای کوڕی خەتەل کە فـەرتنا و قورەیبـە بـوون، چـونکە ڕۆڵـی خراپیـان هـەبوو لـە هانـدانی موشـریکەکان بـۆ کوشـتاری مـسوڵمانان و ڕێگریی لە دینی خوا، ئەوانەی تاوانەکەیان لە پـاڵ هەڵگەڕانـەوەدا بـوو ئەمانـە بوون:

- **میقیسی کوڕی صەبابەی لەیسی**

بۆیە فەرمانیدا بوو بـە کوشـتنی ئـەم کەسـە، چـونکە کەسـێکی ئەنـصاریی کوشتبوو کە بکوژی برایەکی بوو بە هەڵە، دوایی چووبووەوە نـاو قـوڕەیش بـە موشریکی، ئەمە قسەی ئیبنو هیشامە.

بەلازەریش دەڵێ: بەڵام میقیسی کوڕی صەبابەی کینانی، ئەوا براکـەی کـە هاشمی کوڕی صەبابە بوو، مسوڵمان بوو پیاوێکی ئەنصاری بە هەڵە کوشـتی، وایدەزانی موشریکە، میقـیس هـات بـۆلای پێغەمبـەرﷺ و ئـەویش خـوێنی بـۆ سەند لە پیاوە ئەنصاریەکە، وەریگرت و ڕۆیـشت مـسوڵمان بـوو، بـەڵام دوایـی دەسـتدرێژیی کـردە سـەر بکوژەکـە و کوشـتیەوە و ڕایکـرد بـە هەڵگـەڕاوەیی، پێغەمبەریشﷺ فەرمانیدا کە هەرکەسێك پێی گەیشت بیکوژێ، چـونکە بکـوژ بوو و هەڵگەڕانەوەکەی تاوانی دووەم بوو، بـەڵام سـزای کوشـتنەکەی لـە بـری کوشتنەکەی بوو.

- **عەبدوڵڵای کوڕی خەتەل**

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: عەبدوڵڵا پیاوێك بوو لە بەنو تەیمی کوڕی غالب، بۆیە فـەرمان درا بـە کوشـتنی چـونکە مـسوڵمان بـوو، پێغەمبـەرﷺ نـاردبووی بـۆ کۆکردنـەوەی خێـر، پیاوێکیـشی لەگەڵدا نـاردبوو لـە ئەنـصار، خزمـەتکارێکی هـەبوو خزمــەتی دەکـرد، ئـەویش مـسوڵمان بـوو، لـە شـوێنێك لایانـدا و بـە خزمەتکارەکەی وت کە بزنێك سەرببڕێت و خواردن حازر بکات، خەوت و کاتێك

هەستا بینی خزمەتکارەکەی هیچی حازر نەکردووە، دەستدرێژیی کردە سەری و کوشتی، دوایی هەڵگەڕایەوە و بوو بە موشریك، ئەمەش بکوژ بووە و هەڵگەڕانەوەکەی تاوانی سەربار بووە و شەڕی کردووە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ و خەڵکیشی هانداوە.

بەلازەریش دەڵێ: مسوڵمان بوو کۆچی کرد بۆ مەدینە، پێغەمبەری خواﷺ ناردی لەگەڵ پیاوێکی خوزاعەدا بۆ کۆکردنەوەی خێر و سەدەقە، ئەویش پیاوەکەی کوشت، ئەو پیاوە خزمەتی دەکرد و خواردنی بۆ ئامادە دەکرد، ڕۆژێك هات و هیچی ئامادە نەکردبوو، ئەویش ڕقی هەستا و کوشتی، دوایی وتی موحەممەد لەبری ئەو پیاوە دەمکوژێتەوە، بۆیە هەڵگەڕایەوە و چیشی کۆکردبۆوە لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ مەککە، لەوێش بە خەڵکەکەی وت هیچ ئاینێکم نەدیوە لە ئاینی ئێوە باشتر، ئەو پیاوە دوو ئافرەتی سەماکەری هەبوو کە گۆرانییان دەووت بە جنێودان بە پێغەمبەرﷺ، موشریکەکانیش دەچوون بۆلای و ئارەقیان دەخواردەوە، پێغەمبەریشﷺ ڕۆژی فەتحی مەککە فەرمووی ئەوەی بینی با بیکوژێ ئەگەر دەستیشی بە پەردەی کەعبەوە بێت، ئەبو بەرزەی ئەسلەمی کوشتی....

## ڕووداوی پێنجەم: چەند کەسێکی هۆزی عوکەل

بوخاری لە صەحیحەکەیدا دەڵێ: (قوتەیبەی کوڕی سەعید لە ئەبو بیشرەوە ئەویش لە ئەبو قەلابەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ڕۆژێك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بانگی خەڵکی کرد بۆ دیوانەکەی خۆی و پێی وتن: چی دەڵێن دەربارەی قەسامە؟ (قەسامە ئەو سوێندەیە کە خاوەن کەسێکی کوژراو دەیخوات بۆ سەلماندنی تاوانی بکوژەکە)، ئەوانیش وتیان قەسامە

تۆڵەسەندنەوە دەهێنێتە کایەوە، خەلیفەکان هەموویان تۆڵەیان لە بکوژانی کەسی بێتاوان سەندووە بە هۆی قەسامەوە، ئەویش ڕووی کردە من و وتی: ئەبو قەلابە تۆ دەڵێی چی؟ هەستە سەرپێ، منیش وتم ئەی پێشەوای بڕواداران، ئێستا لای تۆ سەرۆکانی سوپا و پیاوماقوڵانی عەرەب کۆبوونەتەوە، ئەگەر پەنجا کەس لەوان شاهیدی بدەن کە لە دیمەشق پیاوێکی ژندار زینای کردووە، بەڵام ئەوان نەیان بینیوە، ئایا تۆ ئەو پیاوە ڕەجم دەکەی؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەی ئەگەر پەنجا کەسیان بڵێن پیاوێك لە حیمص دزی کردووە و بەڵام نەیان بینیوە دەستی دەبڕی؟ وتی: نەخێر، وتم: دە سوێند بە خوا پێغەمبەری خواﷺ کەسی نەکوشتووە تەنها لە بەر سێ شت نەبێ، پیاوێك کەسێکی بە تاوان کوشتبێ، واتە کوشتنی ئەنقەست، کوژراوەتەوە، یاخود پیاوێك زینای کردبێ دوای ژنهێنان، یاخود پیاوێك دژایەتی خوا و پێغەمبەری خوای ﷺ کردبێ و لە ئیسلام هەڵگەڕابێتەوە، خەڵکەکە وتیان ئەی ئەوە نییە ئەنەس فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە گوایە پێغەمبەرﷺ لە دزیدا دەستی بڕیوە و چاوی دەرهێناوە و لەبەر تیشکی خۆر بە جێی هێشتوون، وتم: بامن فەرموودەکەی ئەنەستان بۆ بگێڕمەوە، چەند کەسێك لە هۆزی عوکەل وابزانم هەشت بوون هاتن بۆلای پێغەمبەرﷺو بەیعەتیان لەسەر ئیسلام پێدا، بەڵام نەیانتوانی لەگەڵ کەش و هەوای مەدینەدا بگونجێن بۆیە چوون بۆلای پێغەمبەرﷺ و شەکوای حاڵی خۆیانیان کرد، ئەویش پێی فەرموون ئەی لەگەڵ شوانەکەماندا ناڕۆنە دەرەوەی شار و لەوێ لە بەروبوومی حوشترەکانیش بخۆن و لەوێش بمێننەوە، ئەوانیش قبوڵیان کرد، ڕۆیشتن لەوێ شوانەکەیان کوشت و سامانەکەشیان برد، پێغەمبەریشﷺ کە ئەمەی بیست، کۆمەڵێکی نارد بە دوایاندا و گرتیانن و هێنایانن، ئەویش دەست و قاچی بڕین

و چاوی دەرهێنان و لەبەر تیشکی خۆر وازی لێهێنان تا گیانیان دەرچوو، وتم: جا چی شتێك لەوە خراپترە کە ئەوان کردوویانە لە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە و خەڵکیان بە ناهەق کوشتووە و دزیشیان کردووە، عەنبەسەی کوڕی سەعید وتی: سوێند بە خوا ڕۆژێکی لەو جۆرەم نەبیستووە، وتم: یانی تۆ قسەکەی من ڕەت دەکەیتەوە؟ وتی: نەخێر، بەڵام فەرموودەکەت وەکو خۆی گێڕایەوە، سوێند بەخوا تا ئەم پیاوە بمێنێ لە ناو ئەم سوپایەدا بە خێر و بەرەکەت دەبێ...).

ئەم فەرموودەیە فەرموودەی تاکەکەسە (آحاد) و لە سەردەمێکدا بووە کە لە ناو عەرەبدا کە دەبی زۆر توند و ورد بین لە وەرگرتنی وەها ڕیوایەتێکدا، تیایدا شێوێنرانی تیایە کە پێغەمبەری خواﷺ نەهی لێکردووە، پێغەمبەری خواﷺ نێردراوە بۆ ڕەحمەت بۆ مرۆڤایەتی و ئاسانکار و لابەری کۆت و بەند، هەرگیز سزایەکی نەداوە بە قەدەر تاوانەکە با تۆڵەسەندنەوەش بووبێ، چونکە نەهی لێکردووە، بەڵام ئەگەر یەکێك بڵێ دوای ئەم ڕووداوە نەهی کردووە، هەر وەڵامی پرسیارەکان ناداتەوە، بۆیە ئەم فەرموودەیە یەکێکە لەو فەرموودانەی کە دەبێ لێکۆڵینەوەی ورد لەسەر سەنەد و مەتنەکەشی بکرێت، هەر خواش زانایە.

## ئەوەی دەربارەی مەرجەکانی سوڵحی حودەیبیە هاتووە

لە دەقی مەرجەکانی سوڵحی حودەیبیەدا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ لە کۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچیدا لەگەڵ قورەیشدا مۆری کرد، بەم شێوەیە (ئەمەیە کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا سوڵحی لەسەر کرد لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمر، ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی شەڕ لەسەر خەڵکی هەڵگیرێ تا ماوەی

ده ساڵ، خەڵکی تیایدا دڵنیا بن، هەروەها واز لەیەکتری بهێنن، ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك لە قورەیش هات بۆلای موحەممەد بەبێ پرسی گەورەکەی بیگێڕێتەوە بۆیان، ئەوەشی لەگەڵ مەحەممەد بێت و بێتە ناو قورەیشەوە نەیگێڕنەوە بۆی، هەروەها لە نێوانماندا شوورەیی هەبێت، شمشێر لە یەکتری هەڵنەکێشین و خیانەت لەیەکتری نەکەین، هەرکەسێك ویستی پەیمان و بەڵێننامە لەگەڵ موحەممەددا مۆر بکات بیکات، هەرکەسێکیش ویستی بچێتە پەیمانەوە لەگەڵ قورەیشدا و بەڵێننامە مۆر بکات لەگەڵیاندا با بیکات)، ئیبنو سەعد لە (الطبقات الكبرى)دا ئەمەشی زیاد کردووە: (موحەممەد ئەمساڵ دەگەڕێتەوە لەگەڵ هاوەڵانیدا و ساڵێکی تر دێتەوە و تا سێ ساڵ دەتوانێ بمێنێتەوە، نابێ کەس لە چەکی سەفەر زیاتری پێبێت، شمێشریش لە کالاندا بێت).

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم دەقەدا ئەوەیە کە لە نێوان مەرجەکاندا بەندێك هەیە دەڵێ: (ئەوەی لە قورەیشیەکان بەبێ ڕەزامەندیی گەورەکەی هات بۆلای موحەممەد دەبێ بیگێڕێتەوە، ئەو کەسەشی لەلای موحەممەدەوە هات بۆلای قورەیشیەکان نایگێڕنەوە بۆی)، هێشتا مەرەکەبی سوڵحەکە وشك نەبوو بووەوە کە ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر بە مسوڵمانیی هات بۆلای پێغەمبەرﷺ، بە دزیەوە لە مەککە هەڵهاتبوو بۆ گرۆی مسوڵمانان، بەڵام پێغەمبەرﷺ پۆزشی هێنایەوە لەوەی کە قبوڵی بکات بمێنێتەوە، پێشی وت: (ئەی ئەبو جەندەل ئارام بگرە و پاداشت لە خوا داوا بکە، دڵنیا بە خوا بۆ تۆ و بۆ ئەو بێدەسەڵاتانەی وەکو تۆ دەرگایەك دەکاتەوە و ڕزگارتان دەکات، ئێمە لە نێوان خۆمانو ئەواندا پەیماننامەیەکمان مۆر کردووە، پەیمانی خوامان پێداون ئەوانیش هەروەها، بۆیە ستەم و غەدریان لێناکەین)،

ئەم هەڵوێستە لە لایەن پێغەمبەرەوەﷺ پیادەکردنێکی واقیعیە بۆ ڕاددەی پابەندبوونی مسوڵمانان بە ناوەڕۆکی بەندی یەکەم لە مەرجەکان، ئەگەرچی لەسەر حیسابی کۆمەڵێك بێت کە تازە بڕوایان بە خوا و پێغەمبەرەکەیﷺ هێناوە و ویستوویانە پەیوەندی بە مسوڵمانانەوە بکەن، پێغەمبەرﷺ ناڕاستەوخۆ هۆشیاریی دابوو بەوانەی کە وەکو ئەبو جەندەل بوون کە کۆچ بکەن بۆ غەیری مەدینە، هەروەکو ئەبو بەصیر عوتبەی کوڕی ئوسەید کردی، کە جێگایەکی پەیدا کردو لە (عەیص) لەلای مەروەوە لەسەر ڕێگای کەنار دەریا، ئەوانەشی کە تازە مسوڵمان بووبوون و بە ژێردەستەکان ناسرابوون، پەیوەندییان پێوە دەکرد و لە مەککە دوور دەکەوتنەوە و دەچوون بۆلای ئەو تا وای لێهات نزیکەی حەفتا پیاو لەوێ کۆبوونەوە، بەڵام ئەوەی کە گرنگە لێرەدا بەشی دووەمی بەندەکەیە و ئەوەشمان مەبەستە، وا دەبینرێ کە پێغەمبەرﷺ ناڕاستەوخۆ ڕازی بووبێ بە واز هێنان لەوانەی لە دین هەڵدەگەڕێنەوە و دەیانەوێ پەیوەندی بە لەشکری موشریکەکانەوە بکەن، بەبێ ئەوەی شوێنیان بکەون یاخود داوایان بکەنەوە، ئەمەش کێشە بۆ ئەو کەسانە دروست دەکات کە پێیان وایە دەبێ هەڵگەڕاوە بکوژرێ، چونکە تەنها ڕازیبوونی پێغەمبەرﷺ بەوەی کە ئەوانەی هەڵدەگەڕێنەوە تەسلیمی قوڕەیش بکات بەبێ ئەنجامدانی سزای هەڵگەڕانەوە لەسەری، ئەوا جێبەجێکردنی حوکمێك پشتگوێ دەخرێت کە وا دەزانرێت حوکمی شەرعییە، پێغەمبەریشﷺ زۆر دوورە لەوەی کە ڕازی ببێت بە شتێك سنووری حوکمەکانی خوای پەروەردگار ببەزێنێت، ئەوەی کە زیاتر ئەو بارە بەهێز دەکات ئەوەیە کە ئەم سوڵحە وەکو پەیماننامەیەکی سیاسیشی لێهات کە ماوەکەی بۆ دە ساڵ دەیخوارد، هیچ کەسێکیش لە مسوڵمانان ناتوانێ کە بڵێ

پێغەمبەرﷺ بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوتی سیاسی و دەعەوی سازشی لەسەر سنوورەکانی خوای گەورە کردووە.

لەوانەیە کەسێك بڵێ پێغەمبەرﷺ مەبەستی ئەوە نەبووە، بەڵکو مەبەستی ئەو کەسانە بووە کە هەڵدێن و بە هەڵگەڕاوەیی ڕادەکەن بە نهێنی بۆ لای لەشکری قوڕەیش، ئەوانە پێغەمبەرﷺ هەقی نەبێ بە سەریانەوە، ئەمەش ڕایەکی جوانە، بەڵام بەو مەرجەی دەقەکە پشتڕاستی بکاتەوە، بەڵام وا نییە، دەقەکە دەڵێ: (هەرکەسێك هات بۆلای قوڕەیش لەوانەی لەلای موحەممەدن نایگێڕنەوە)، بەڵام چۆنیەتی هاتنەکەی دیاریی نەکردووە، لەوانەیە کەسێك بە ئاشکرا و ئازادانە پەیوەندی بە قوڕەیشەوە بکات، هەروەکو کەسێکیش دەگرێتەوە کە بەدزیەوە و بەڕاکردن بچێت، هەرچۆنێك بێت ئەوﷺ ئەگەر بیویستایە ڕێگر بێت لە کەسێك کە بیەوێ لە ئیسلام دەرچێت و بچێت بۆلای کافرەکان، ئەوا ئەو هەڵوەشێنەرەوەی پەیماننامەکە دەبوو.

هەندێك دەڵێن گوایە مێژووی حەددی هەڵگەڕانەوە دەگەڕێتەوە بۆ دوای سوڵحی حودەیبیە، ئەمەش قسەیەکە دەدرێتەوە بە سەروچاویدا، چونکە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی نییە کاتی چەسپاندنی ئەم سزایە دیاریی بکات، لەوانەیە وەڵامی ئەم مەسەلەیە لە ئاشکراکردنی حوکمی شەریعەتدا دەست کەوێ دەربارەی ئەوانەی لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە لە دواییدا پشت بە خوا بۆ خوێنەر ڕوون دەبێتەوە.

## ئایا پێغەمبەری خواﷺ هیچ هەڵگەڕاوەیەکی کوشتووە؟

ئەوەی جێگیرە و دیارە پێغەمبەری خواﷺ هیچ کەسێکی هەڵگەڕاوەی نەکوشتووە بە درێژایی ژیانی پیرۆزی، شافیعی دەڵێ: (پێغەمبەری خواﷺ

وازی له هیچ حەددێكی شەرعی نەهێناوە بە سەر خەڵكیـەوە لـە كـاتی خۆیـدا، بەڵكو باشترین كەسێك بووە كە بە ئەنجامدانی حەددە شەرعییەكان هەستاوە، تەنانـەت بـەو ئافرەتـەی كـە دزی كردبـوو، وت: (ئەوانـەی پـێش ئێـوە بۆیـە تیاچوون كە ئەگەر كەسێكی خانەدان دزی بكردایـە تیایانـدا وازیـان لێـدەهێنا، ئەگەر بێدەسەڵاتێكیش بوایـە سـزایان دەدا)، شـافیعی دەڵـێ: (هەنـدێك كـەس ئیمانیان هێنـا، دوایـی هەڵگەڕانـەوە، ئینجـا خۆیـان وا پیـشاندا كـە ئیمانـدارن پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەیكوشـتن)، بەیهـەقی دەڵـێ: (ئەمـەمان ڕیوایـەت كـرد دەربارەی عـەبوڵڵای كـوڕی ئـەبو سـەرح كاتێـك شـەیتان فریویـداو چـووە نـاو كافرانەوە، دوایی گەڕایەوە بۆ ئیسلام، دەربارەی پیاوێكی تریش لە ئەنـصار)، ئیبنو تـەلاعیش دەڵـێ: (لـە هـیچ كـام لـە دانـراوە ناودارەكانـدا نـەهاتووە كـە پێغەمبەرﷺ كەسـێكی هەڵگـەڕاوە یـان زینـدیقی كوشـتبێ)، ئەمـە عـەینی لـە شەرحی بوخاریدا ئەمەی باسكردووە.

# دکتۆر تەها جابر ئەلعەلوانی



* سـاڵی ١٣٥٤ ك– ١٩٣٥ ز لـە عـیراق لـەدایك بووە.

* خوێنـدنی سـەرەتایی و ئامـادەیی لـە عـیراق تەواو کردووە، سـاڵی ١٣٧٨ ك– ١٩٥٩ ز بڕوانامـەی باڵای لە کۆلێژی شەریعە و یاسا لـە زانکـۆی ئەزهـەر وەرگرتووە.

* سـاڵی ١٣٨٨ ك – ١٩٦٨ ز بڕوانامـەی ماسـتەری لـە کۆلێـژی شـەریعە و یاسا لە زانکۆی ئەزهەر وەرگرتووە.

* سـاڵی ١٣٩٢ ك – ١٩٧٣ ز بڕوانامـەی دکتـۆرای لـە (أصـول الفقـە)دا لـە زانکۆی ئەزهەر وەرگرتووە.

* ساڵی ١٩٧٥ – ١٩٨٥ وەکو پرۆفیسۆری (فقە) و ئصولەکانی لە زانکـۆی (ئیمام موحەممەد بن سعود)ی ئیسلامیی لە (ریاز) کاری کردووە.

* سـاڵی ١٩٨١ بەشـداریی لـە دامەزرانـدنی پەیمانگـەی جیهـانیی فیکـری ئیسلامییدا کردووە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

* سەرۆکی پەیمانگە و ئەندامی ئەنجومەنی ئەمیندارەکانی بووە.

* ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندنی رابیتەی جیهانی ئیسلامییە لە مەککـەی پیرۆز.

* ئەندامی دەستەی فیقهی ئیسلامیی نێودەوڵتییە لە (جەددە).

* سەرۆکی ئەنجومەنی فیقهیی ئەمریکای باکوور بووە.

* لێکۆڵینـــەوەی لــە کتێبــی (المحــصول في علــم أصــول الفقــه)ی ئیمــام فەخرەددینی رازی کردووە کە شەش بەرگە.

* چەندین کتێب و توێژینەوەی تری لە بوارەکانی (فقه) و (أصول الفقـه)دا بە زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی هەیە، لەوانەش:

– الاجتهاد والتقليد في الاسلام.

– أدب الاختلاف في الاسلام.

– أصول الفقه الاسلامي: منهج بحث ومعرفة.

– الازمة الفكرية المعاصرة: تشخيص ومقترحات علاج.

– Outline of a Cultural Strategy.

– The Quran and the Sunnah: Time- Space Factor.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی فەرهەنگیی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پازدەهەمی کۆچی (١٤٠١ ك – ١٩٨١ ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لە پێناو تەئصیلکردنی مەسەلە هەمەکییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الکلّیات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلامەوە.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیری و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بە ئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازیی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی، پەیمانگا چەند هۆکارێك دەگرێتە بەر، لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستیی و فیکریی.

– هاوکارییکردنی هەوڵ و کۆششی زانا و توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و، بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.
– ئاڕاستەکردنی توێژینەوە زانستیی و ئەکادیمییەکان لە پێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفەدا.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبیی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لە ڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستیی هاوبەش هەیە.

# ناوەڕۆك